**به ناوی خوای بەخشندەو میهرەبان**

**★ ناوی پەڕاو :سلاّو لە فریشتەکان**

**★ نووسەر : عوسمان محمد ڕەشید**

**★ تیراژ : ٢٠٠٠ دانە**

**★ ژمارەی سپاردن :**

**★ چاپی: یەکەم ٢٠١٤**

( ئەی ئادەمیزاد کە لە دایك بویت ،ئەوانەی لەدەورت بوون پێدەکەنین و تۆ دەگریایت،دە وابژی کە تۆ مردیت ، ئەوان بگریین و تۆ پێبکەنیت).

## پێشەکی

سوپاس وستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهان و درووودو سەلامیش لەسەر گیانی پێشەوا و رابەرمان و یار و یاوەر و شوێنکەوتووان.

نامیلکەی زەردەخەنەی هیوا،دیمەنەکانی قورئان ، دۆستانی خوا ، فیداکاران، فراوانی مانا لە قورئاندا، کەوتنە بەر دیدی خوێنەران،زۆر دڵخۆش بووم و زۆر سوپاسی خوا دەکەم کە سوودێکی زۆریان لێ بینراوە، ئەوەی کە پێم گەیشتوەتەوە :

١-زۆر بەڕێز لە رێی تەلەفون و فەیس بووکەوە خۆشەویستی برایانەیان دەردەبڕن و ئاماژە بەوە دەکەن کەسوودیان لە نووسراوەکانم وەرگرتووە.

٢- زانایانی کۆیە کەوتارم بۆدان ساڵی ٢٠١٤،مامۆستایەکیان وتی : کتێبی ژیانەوەم بە ٢٥ وتار باس کردووە بۆ ئامادەبووانی نوێژی هەینی .

٣-لەچەند رادیۆیەك بابەتەکانی کەبڵاوی دەکەمەوە لەفەیس بووك رۆژانە بۆ خەڵکی دەخوێننەوە .

٤-مامۆستا موسای بیارەیی کەئەم نامیلکەیەی خوێندەوە وتی: هەقە هەموو مامۆستایەکی ئایینی ئەم نامیلکەیە بخوێنێتەوە ، هەر لەسەرداوای بەڕێزیشیان چاپکردنی ئەم بەشەمان پێشخست.

ئەمجارەش بەحوکمی گەڕان و خوێندنەوە رێم کەوت لەم بابەتانە، کە ئەم بەشەیان ناوم نا(سڵاو لەفریشتەکان)بەشی پێنجەمە لە زنجیرەی هەزارو دوو بەوهیوایەی کە هەردەم گیان لەسەردەست بین بۆ دینی خوا.

زنجیرەکەشم ناونا (هەزارو دوو)و دەست لەدەست و قووەت لە خوا تاهەزار و دوو بابەتی ئیمانی و دەعەوی ناوەستم.. بەهیوای دوعای خێرتان.

## سلاّو له فریشته‌كان

سلاّو له فریشته‌كانی په‌روه‌ردگارم، دیمه‌نی خۆشی و به‌شاره‌تی پیاوباشانه له دوا ساته‌كانی ژیاندا، كه به‌ڕاستی هه‌قه هه‌میشه له یادمان بێت و كاری بۆ بكه‌ین، بۆ ئه‌وه‌ی به دڵێكی خۆشه‌وه ئه‌م دنیایه به‌جێبهێڵین به‌ره‌و قیامه‌ت و به‌ره‌و لای خوای په‌روه‌ردگاری میهره‌بان، كه میهره‌بانی دایك و باوكمان ڕه‌نگدانه‌وه‌ی یه‌ك له‌سه‌ر سه‌دی ڕه‌حمه‌تی ئه‌و په‌روه‌ردگاریه له‌م دنیا فانیه‌دا.

پرسیاركرا له نووسه‌ری گه‌وره ی ئیسلام (**مصطفى** صادق الرافعی ) : ڕقت له مردنه؟ وتی: نه‌خێر، به‌ڵكو ڕقم له گوناهه‌كانمه ، چونكه مردن دۆزینه‌وه‌ی جیهانێكی گه‌وره‌تره ، داوا ده‌كه‌م له خودای گه‌وره ئاخرخێر بین.

دكتۆر (**محمد سعید رمضان البوطی** ) ده‌ڵێت : (مرۆڤ ڕه‌نگه حه‌ز به مردن نه‌كات و لێی بترسێت ، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌دا خۆشی ده‌وێت، به‌هوی كه‌موكورتی جێبه‌جێكردنی هه‌قه‌كانی خوا له‌سه‌ری و له‌به‌ر ئه‌و گوناهانه‌ی كه كردونی.من ده‌ڵێم: ئه‌وه‌ی به‌ڕاستی له‌ززه‌تی خۆشه‌ویستی خوای چه‌شتبێ ئه‌وه حه‌ز و شه‌وقی بۆ لیقای خوا زاڵ ئه‌بێت به‌سه‌ر ترسه‌كه‌یدا).

شێخی پایه‌به‌رزیش (محمد فاروق النبهان) ده‌ڵێت : (دوای مردن ، بڕوادار هه‌قیقه‌تی نه‌فسی خۆی و به‌ڵێنه‌كانی خوای بۆ ده‌رده‌كه‌وێت ، ئه‌وسا تێده‌گات كه دونیا ته‌نها به‌ندیخانه‌یه‌كی تاریك بووه و ڕۆحی تیایا به‌ندكرابوو . پیاو باشان به خۆشیه‌وه پێشوازی له مردن ده‌كه‌ن له گومانی باشیانه‌وه به‌خوا و به هۆی ئه‌و سه‌كینه ئیمانیه‌ی كه هه‌یانه).

یەکێ لە جوانیەکانی ئەم ئایینە ئامادەکردنی مرۆڤە بۆ ئەو گەشتە و، بڕوادار بەهۆی بڕواکەیەوە دڵنیایە لە لیقای ئاخیرەت و ئەگەر ئەوە نەبوایە خەم و خەفەت ئەیکوشتین لە کاتی بە خاك سپاردنی دۆستان و خۆشەویستانماندا.

راغبی ئەسفەهانی دەڵێت (ئەگەر مرۆڤ هەر ئەم ژیانە کورتە کەمە پڕ ناخۆشیەی هەبوایە و قیامەتی نەبوایە ، بەڕاستی حاڵی ئاژەڵ لە حاڵی ئەم باشتر ئەبوو ).

هەروەها دەڵێت ( مرۆڤ لە دنیادا حاڵی وەك حاڵی جوجەڵەیە لە هێلکەدا، چۆن جوجەڵەکە کامڵ نابێت تا لە قەوغەکەی نەیەتە دەرەوە،مرۆڤیش تا لەم بەرگە ماددیەی ئازاد نەبێت و نەچێت بەرەو قیامەت کامڵ نابێت).

ئەوەی مەبەستە لەم نامیلکەیەدا ئەوەیە کە ئامادەبین و شوێن هەوا و ئارەزوو نەکەوین،چونکە کەسمان نازانین کەی فریشتەی گیانکێشان لە دەرگامان ئەدات، بەڕاستی دنیا وەك ئوتێلێکە کە بۆ چەند ڕۆژێك تیایا بین و چاوەڕێ بین ها ئێستا یا تاوێکی تر بێن بە دواماندا جا خۆشبەخت ئەوەیە کە ئامادە بێت و شتومەکی پێچابێتەوە و لەسەر پێبێت بۆ ڕۆشتن.

**دوا هەناسە :**

شێخ شەعراوی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت :

وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ذَلِكَ مَا كُنْتَ مِنْهُ تَحِيدُ (١٩) وَنُفِخَ فِي الصُّورِ ذَلِكَ يَوْمُ الْوَعِيدِ (٢٠) وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ (٢١) لَقَدْ كُنْتَ فِي غَفْلَةٍ مِنْ هَذَا فَكَشَفْنَا عَنْكَ غِطَاءَكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ (٢٢)ق/واتە: سەکەراتی گیانکێشان وا دیاری دا،هەرئەمەشە کە تۆ نەتدەویست تووشی ببی،فوو بەکەڵەشاخدا دەکرێ ،ئەوێ رۆژێ ،

دەبێ هەڕەشە وەدی بێ ، هەرکەسێ دێ ، یەکێك وەپێشەخۆی داوەو یەکێکیش شایەتی دەدا ،تۆ لەمانە بێ هەواڵ بووی ، وا پەردەمان لەسەر لادای، چاوت ئەمڕۆ زۆر بڕ دەکا .

شێخ شەعراوی دەڵێت : باوکم سەری لەسەر سنگم بوو کە گیانی دەدا لە دوا هەناسەیدا وتی:ئەمین کوڕم ئەو هەموو کۆشکەت بیناکردووەو پێت نەوتووم ، ئاخر کوڕم من تۆم خۆش دەوێت نازانی پێم خۆشە(تومەز کاروکردەوە چاکەکانی شەعراویان پیشان داوە کەخێری بۆ ئەمیشە). ئیتر گیانی سپارد..

## حەزدەکەیت بگەیتەوە بە خوا :

لە فەرمودەدا هاتووە (**مَن أحبَ لقاء الله أحب الله لقاءه، و مَن كرِهَ لقاء الله كرِهَ الله لقاءه**) مسلم \٦٥٠٧\ هاوسەرێکی خۆشەویست (د.خ) پرسیاری کرد، ئێمە حەزمان بە مردن نیە .خۆشەویست (د.خ) فەرمووی (مەبەست ئەوە نیە،بەڵکو مەسەلەکە ئەوەیە کاتێك بڕوادار لەسەرە مەرگدا مژدەی خۆشی پێدەدرێت، حەز بە لیقای خوا دەکات و خواش حەز بە لیقای ئەو دەکات ،کافریش لەسەرە مەرگدا سزای خوای پیشان ئەدرێت ،بۆیە حەز بە لیقای خوا ناکات و خواش حەزبە لیقای ئەو ناکات).

قورئان دەفەرمویێت (**الذين تتوفاهُم الملائكةُ طيبين يقولون سلام عليكم) النحل ٣٢.**

زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت (فریشتەکان دێنە لای بڕوادار لە سەرەمەرگدا و دەڵێن : مەترسە لەوەی کە بۆی دەچیت ،خواش ترسەکەی دەڕەوێنێتەوە ،

خەفەتیش مەخۆ بۆ دونیا و ئەهلەکەی،مژدەت لێبێت بە بەهەشت.. جا بڕوادار بەو مژدە خۆشەوە دەمرێت).

هەرکەسەو مردنەکەی بە جۆرێکە ،ئیبن مەسعود دەڵێت :(مەرگی موجافات سووك کردنی مردنە لەسەر بڕوادار).

ئەبو سەعلەبەی خەشنی دەڵێت : (من ئاواتە خوازم وەك ئێوە نەخنکێم لە کاتی مردندا)،شەوێکیان لە ماڵەوە گوێیان لێبوو بانگی (عبدالرحمان) ی ئەکرد، لە کاتێکدا عبدالرحمان لەگەڵ خۆشەویست (د.خ) شەهید بووبوو،ئنجا چوو نوێژی کرد و لە سوجدەدا گیانی سپارد.

یەکێ لەپێشینان بە هاوەڵەکانی وت : من وەك ئێوە نامرم ،من بانگ دەکرێم و وەلاّم ئەدەمەوە.ڕۆژێ دانیشتبوو لەگەڵ هاوەڵەکانیدا وتی (لبیك) وەك بانگکرابێت بۆ مردن،ئنجا گیانی دەرچوو.

یەکێکی تریش لە پێشینان لەگەڵ هاوەڵەکانی دانیشتبوو، گوێیان لە دەنگێك بوو وتی : فلاّن وەرە ، بەخوا ئەمە دواساتی دونیاتە ،ئەویش هەستا و وتی : بەخوا ئەوە (حادی الموت)ە،خواحافیزی لە هاوەڵەکانی کرد،ڕۆیشت بەرەو دەنگەکە و دەیوت : سڵاو لە نێرراوانی خوا (سلام علی المرسلین)، سوپاس خوای پەروەردگاری جیهانیان (والحمد لله رب العالمین ) ئیتر دەنگ نەما ،کە بەدوایا چوون سەیریان کرد مردووە.

یەکێکی تر دانیشتبوو قورئانی دەنووسی ،قەڵەمەکەی دانا و وتی : ئەگەر مردنەکەتان ئاوا بێت ،بەڕاستی مردنێکی خۆشە و دوای ئەوە یەکسەر مرد.

یەکێکی تر فەرمودەی دەنووسی،قەڵەمەکەی داناو کەوتە پاڕانەوە و کۆچی دوایی کرد.

عومەری کوڕی عبدالعزیز دەڵێت : حەزناکەم گیان کێشانەکەم لە سەر سوك بکرێ، چونکە ئەوە دواهەمین شتە کە گوناهی بڕواداری پێئەوەرێت.
نەخەعی ئەڵێت: پیاو باشان حەزیان کردووە گیان کێشان لەسەریان سووك نەکرێت.
عومەر کوڕی حوسەین کوڕی عبداللە ی جومحی کە قازی مەدینە بوو لە سەرەمەرگا دەیووت (لمثل هذا فليعمل العاملون) الصافات ٦١ ،ئیبن وەهەب دەڵێت بە ئیمام مالیکم وت: تۆ بڵێی بەهەشتی دیبێت کە ئاوای وتووە؟ وتی: بەڵێ.

## کۆچی دوایی پێغەمبەر (د.خ) :

ڕۆژێك پێش وەفاتی پێغەمبەر (د.خ) کەڕۆژی یەك شەممە بوو ،غولامەکانی ئازاد کرد،حەوت دیناری هەبوو هەمووی کرد بەخێر،چەکەکانیشی کرد بە سەدەقە بۆ موسوڵمانان ، لە شەوەکەیدا عایشە زەیتی خواست لە دراوسێکەیان بۆ هەڵکردنی چرا، قەڵغانەکەشی بارمتە بوو لای جولەکەیەك بە سێ مشت جۆ.
ڕۆژی دووشەممە لە کاتێکدا موسڵمانان لە نوێژی بەیانیدا بوون و ئەبوبەکریش نوێژی بۆ دەکردن،لە پڕێکا پێغەمبەر (د.خ) پەردەکەی ژوورەکەی عائیشەی لادا کە دەیڕوانی بەسەر حەرەمی مزگەوتدا و سەیرێکی کردن ، لە کاتێکدا نوێژیان دەکرد.پاشان زەردەخەنەیەکی جوانی بۆ کردن ،ئەبوبەکر هەنگاوی نا بێتە دواوەوە بۆ ناو ڕیزی نوێژ خوێنان،وایزانی پێغەمبەر (د.خ) دەیەوێت بێت بۆ نوێژ.

خەريك بوو موسڵمانان نوێژەكەيان ببڕن لە خۆشی هاتنی پێغەمبەر (د.خ)، بە دەستی پیرۆزی ئیشارەتی بۆ كردن كە نوێژەكەیان تەواو بكەن ، ئنجا پەردەكەی دایایەوە و چووە ژوورەوە ، دوای ئەوە ئیتر ئامادەی نوێژی تر نەبوو.
لە چێشتەنگاودا خۆشەویست (د.خ) فاتیمەی بانگ كرد و شتێكی چرپاند بە گوێیدا،دەستی كرد بە گریان،پاشان بانگی كردەوە وشتێكی تری چرپاند بە گوێیدا، دەستی كرد بە پێكەنین ،كە دوایی پرسیاریان لێكرد وتی: یەكەمجار فەرمووی : لەم نەخۆشیەمدا دەمرم بۆیە گریام،دووەمجاریش فەرمووی : یەكەم كەس من پێی دەگەمەوە، بەمەش دڵخۆشبووم.
فاتیمە كە ئەو ئازار و نەخۆشیەی باوكی بینی وتی: ئەی هاوار بۆ باوكم ،ئەویش پێی فەرموو : فاتیمە كچم ئیتر لەمەودوا باوكت ئێش و ئازاری نامێنێت و پشووئەدات.
ئنجا حەسەن و حوسەینی بانگ كرد و ماچی كردن،وەسیەتی فەرموو كە باش بن لەگەڵیاندا، پاشان هاوسەرەكانی بانگ كرد و ئامۆژگاری كردن.
وردە وردە ئازارەكەی زیادی دەكرد و ئاسەواری ژەهرەكەی خەیبەر زیاتر دیاری دەدا ،بۆیە بە عائیشەی فەرموو: هەتا ئێستا هەست بە تاڵاوی ئەو ژەهرە دەكەم كە لە ڕۆژی خەیبەردا خواردم،ئێستا هەست دەكەم هەناومی گرتیبەرداوە. ئنجا ئامۆژگاری كرد بۆ خەڵك و فەرمووی : ئاگاتان لە نوێژەكانتان بێت،بەزەییتان بێتەوە بە كەنیزەكەكاندا،ئەمەی چەند جارێك وتەوە.
دوای ئەمە گیانەڵای سەرەمەرگ دەستی پێكرد،سەری لەسەر ڕانی عائیشە بوو،عبدالرحمن كوڕی ئەبوبەكر هاتە ژوورەوە سیواكێكی بە دەستەوە بوو ،

عائیشه دەڵێت: من پشتی پێغەمبەرم گرتبوو،بینیم سەیری دەكات ،زانیم كه حەزی له سیواك كردنه.وتم:بۆت وەربگرم؟ به ئیشارەتی سەری فەرموی:بەڵێ.
سیواكم بۆ كرد كەمێك زبر بوو وتم: بۆت نەرم بكەمەوه؟
به سەر ئیشارەتی كرد و فەرمووی : بەڵێ.
بۆم نەرمكردەوه و سیواكی پێكرد ، لەبەر دەستیا كوندەیەكی ئاو دانرا بوو، دەستی تێدەخست و دەموچاوی پیرۆزی پێتەڕدەكرد و دەیفەرموو : لا إله إلا الله ئای خوایه مردن ساته و ساتی سەختی هەیه.
ئنجا پەنجەی بەرزكردەوه و چاوی بڕیه بنمیچی ماڵەكه ،لێوەكانی دەجولاً دەیفەرموو (**مع الذين أنعمت عليهم من النبيين و الصديقين و الشهداء و الصالحين،اللهم اغفرلي وارحمني ،والحقني بالرفيق الاعلى**)
واته: خوایه بمخەیته ڕیزی ئەوانەی ناز و نیعمەتت بەسەردا ڕشتن له پێغەمبەران و شەهیدان و سالحان ،خوایه لێم ببوره و ڕەحم پێبكه،خوایه ڕەفیقی ئەعلا،خوایه ڕەفیقی ئەعلا.
ئەم وتەیەی دوایی سێ جار وتەوه،دەستی شل بوو گیانی پاك و پیرۆزی سپارد و گەیشت به ( ڕەفیقی ئەعلا).
كۆچی دوایی خۆشەویستمان چێشتەنگاوی ڕۆژی دووشەممه دوازدەی ربيع الاول ساڵی یازدەی كۆچی،كه تەمەنی پیرۆزی **٦٣** ساڵ و چوار ڕۆژ بوو.
كه كۆچی دوایی كرد فاتیمه وتی: بابه گیان،وەڵامی پەروەردگارت دایەوه كه بانگی كردی، بابه گیان ، جەننەتی فیردەوس جێگاته ، بابه گیان پرسه و سەرەخۆشی بۆ لای جوبرائیل دەبەین. ل **٥٥٦**/گوڵاوی سەمۆر.

ئەبوبەکر لە قەراغ شار بوو هاتەوە و چووە سەر جەنازەکەی و بوردەکەی سەری لابرد ماچی کردو بە گریانەوە فەرمووی : دایك و باوکم بە قوربانت بن هەرگیز نابێت تۆ دووجار بمریت ،تەنهاجارێکە و ئەوا نۆشیت.هەروەها فەرمووی: (**طبت حياً و ميتاً**) چەند جوانی بەزیندوویی و بەمردوویی.

## پێغەمبەر (د.خ) شەهیدە:

لە ئەنجامی لارولەوێری و پەیمان شکێنی جوولەکەوە، پێغەمبەر (د.خ) سوپای کۆکردەوەوچووە سەر قەلاکانی خەیبەر، ڕۆژی یەکەم ئالا بەدەست (ئەبوبەکر )ەوە بوو قەلاکە فەتح نەکرا، ڕۆژی دووەمیش بە دەست (عمر)ەوە بوو هەر فەتح نەکرا، پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: سبەینێ ئالاکە ئەدەمە دەست پیاوێك کە خواو پێغەمبەری خۆش دەوێت و خواو پێغەمبەریش ئەویان خۆش دەوێت و قەلاکەش فەتح دەکات، هەموو هاوەڵان ئاواتە خوازبوون ئەوکەسە بن کە ئالاکەیان پێئەدرێت، بۆ بەیانی پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی: کوا عەلی؟؟ وتیان: چاوی نووساوەو ناساغە، فەرمووی: بیهێنن، کە هێنایان تفی موبارەکی دا لە چاوی و دوعای بەسەردا خوێند، دەم و دەست چاك بوو، هەردەتووت نەخۆشیش نەبووە، ئنجا ئالاکەی دایە دەستی وتوانی فەتحی قەلاکە بکات هەروەك پێغەمبەر فەرمووی ، قەلاکانی تریش خۆیان دا بەدەستەوەو لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێکەوتن. ئنجا ژنێکی جوولەکە بەناوی زەینەب ، مەڕێکی سەربڕی و لێی ناو ژەهری پێوەکرد بەتایەبەت دەستەکەی کەزانی پێغەمبەر حەزی لێدەکات، کە بۆیان دانان هاوەڵێك بەناوی بیشر پاروویەکی لێخواردو پێغەمبەریش کەختیە دەمیەوە فەرمووی: ئەم گۆشت و ئێسقانە دەڵێت:

مەحۆ ژەهرم پێوەکراوە، کاتێك ژنەکەیان هێنا دانی نا بە تاوانەکەیداو وتی: ژەهرم پێوەکردو وتم: ئەگەر پێغەمبەر بێت خوا دەیپارێزێت و ئەگەر واش نەبێت لە کۆڵمان دەبێتەوە، پێغەمبەر پێی فەرموو: خوا ناهێڵێ ئەوەت بۆ بچێتە سەر و تۆ ناتوانی من بکوژیت. هاوەڵان وتیان بیکوژین، پێغەمبەر نەیهێشت، بەڵام کە بیشر مرد درایە دەست کەس و کاری ولە تۆڵەی ئەودا کوشتیان .

هەرچەند پێغەمبەر گۆشتەکەی نەخوارد بەڵام هەر زیانی لێداو ساڵانە ئازاری بۆ دەهاتەوە و ئەنەس دەڵێت: کاریگەری ژەهرەکەم دەبینی لەسەر پووك و پێشەوەی زمانی پێغەمبەردا.

پێغەمبەر (د.خ) لەم بارەیەوە لە دوارۆژەکانی تەمەنیدا دەفەرموێت: (**ما زالت أكلة خيبر تعتادني كل عام، حتى كان هذا أوان قطع أبهري**) **أبو نعيم في الطب**، هەروەها لە دوارۆژەکانی تەمەنیدا بە عائیشەی فەرموو: (**ما أزال أجد ألم الطعام الذى أكلت بخيبر، فهذا أوان وجدت انقطاع أبهري من ذلك السم**) **رواه بخاري**. واتە: بەردەوام هەست بە ئازاری ئەو خواردنە دەکەم کە لە خەیبەر خواردم، ئێستاش کاتی ئەوەیە کە خوێنبەرم بەو ژەهرە دەتەقێت.

دکتۆر **مجاهد أبو المجد** لە میسر سێ سەعات لەگەڵ زانایانی بواری شەریعەو زانایانی بواری پزیشکیدا تاووتوێی ئەم فەرموودەیەیان کردو گەیشتنە ئەوەی کە موعجیزەیەکی گەورەی تیایە: زانایان وتیان لە کۆنەوە( زەرنیخ و ڕەصاص ) وەك ژەهر بەکار هاتووەو ئەو ژەهرەش سەلماوە کە لە خوێنبەردا دەنیشێ و دەیتەقێنێت، ئنجا ئەم نەخۆشیە ١٤ ڕۆژێك دەخایەنێ و لە نیشانەکانی سەریەشەو ئارەق کردنەوەی زۆرو بێهێزیە، کە هەمووی لە پێغەمبەردا دیاری داو چواردە ڕۆژێك بەوحاڵەوە مایەوەو ئارەقی زۆری دەکردەوەو سەری دەیەشاو

دەچوونە ژێر باڵی..باشە پێغەمبەر چۆن زانی کەکاتی ئەوە هاتووە بەهۆی ژەهرەکەوە بۆری خوێنبەری بتەقێت؟؟ ئەگەر خوا ئاگاداری نەکردبێت ؟؟!

لە کاتێکدا بۆ یەکەم جار لە سەرچاوە پزیشکێکاندا لەساڵی ١٨٢٦ ز دا باسی خوێنبەرو جەڵتەو تەقینی ئیشارەتی پێدراوەو لە ساڵی ١٩٥١ دا زیاترباسکراوە، بەڵێ. ئاماژەکردنی پێغەمبەر بۆ ئەو مەسەلەیە پێش چواردە سەدە موعجیزەیەکی گەورەیەو بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرێتی ئەو زاتە پایە بەرزە. کە بەمەش بێجگە لە پلەی پێغەمبەرێتی پلەی شەهیدیش خوا کردی بە نسیبی.(بەرەو ئیسلام)لا ٩٢.

## فاتیمەی زەهرا :

فاتیمە لەدوا رۆژەکانی تەمەنیدا بە ئەسمای کچی عومەیسی وت : زۆر خەمە کەمردم وکفنیان کردم و بردیانم بۆ سەرقەبران لاشەم لەسەرداره مەیتەکەم پیاوان بیبینێت ، ئەویش وتی : من لەحەبەشە دارەمەیتم بینیوە کە ئەملاو ئەولای هەیەو بەوەش مردووەکە شێوازی لاشەی دەشارێتەوە ، ئەوەبوو دارەمەیتێکی وایان بۆدروستکردوو کەمرد بەوەبردیان بۆ سەرقەبران و قوماشێکیان دا بەسەریدا و فاتیمە یەکەم کەسە کە بەوشێوەیە برا بۆسەرقەبران و پێشتر دارە مەیتەکان ئەملاو ئەو لای نەبوو.(وتارێکی خالید الراشد ).

## پێشەوا ئەبوبەکر:

لە دوارۆژەکانی تەمەنیدا ،وەسیەتی کرد عومەر ببێتە خەلیفەی موسڵمانان و زۆر ئامۆژگاری کرد،هەرچەندە عومەر وتی: من پێویستم پێی نیە، ئەبوبەکر

وتی: ئاخر ئەو پێویستی بە تۆیە،عومەر بە ناچاری بووە خەلیفە .لە سەرە مەرگدا کە پێشتر باخێکی خۆی دابوو بە عائیشە داوای لێکرد کە بیگێڕێتەوە سەر میرات نەباوەکو گوناهباربێت ،ئەویش گێڕایەوە بۆ وەرەسە .

ئەبوبەکر بە عائیشەی وت : لەوکاتەوە بوومەتە کاربەدەستی موسڵمانان نە دینارێك نە درهەمێکمان نەخواردوون (هەرچی وەرگرتبوو ناردیەوە بیت المال).

کە مردم تەنها ئەم بەندە حەبەشیە و ئەو وشترە شیردەرەو ئەم قەدیفە سواوەم لاماوە بیانێرەوە بۆ عومەر .

دوای ئەبوبەکر کە عائیشە ئەوانەی ناردەوە بۆ عومەر،عومەر زۆر گریا و وتی: ڕەحمەتی خوا لە ئەبوبەکر بێت ،بەم کارەی ئەوانەی دوای ئەو دێن چاك ماندوو دەبن!!

ئەبوبەکر لەسەرەمەرگدا لە عائیشەی پرسی:خۆشەویست(د.خ) چەند شەممە بووکۆچی دوایی کرد؟ وتی : دووشەممە . وتی ئەمڕۆ چەند شەممەیە؟ وتی : دووشەممە،ئەبوبەکر وتی:لە خوا داوادەکەم ئەمشەو تەواو بم.

ئەوە بوو خوای گەورە هەر ئەو شەوە بردیەوە بەرەوقیامەت.ئەبوبەکر یەکەم کەسە کە موسڵمان بووە و قورئانی کۆکردۆتەوە ،یەکەم کەسە قورئانی ناو نا (مصحف) ،یەکەم کەسە ناونرا خەلیفەو ، چوار پشتی (صحابە) بوون.

**پێشەوا عەلی :**

زۆر ماندوو بووبوو بە دەست خەلافەتەوە، دەگێڕێتەوە کە شەوێك لە خەودا بە خزمەت خۆشەویست دەگات (د.خ) و شکاتی حاڵی خۆی دەکات بە دەست عێراقیەکانەوە و ئەویش دەفەرموێت:بەم زووانە لەدەستییان دەحەسێیتەوە..

دوای ئەم خەوە بە سێ ڕۆژ لەلایەن دوو کەسی خەواریجەوە لە کاتی چوون بۆ نوێژی بەیانی  شەهید کرا ،دیارە پێشتر خۆشەویست مژدەی بەهەشت و شەهیدی دابوویە.

## سەعدی کوڕی موعـاز :

لە غەزای خەندەق دا بەهۆی تیرێکەوە کە بەربالّی کەوت بریندار بوو،سەعد دوعای کرد وتی: خوایە خۆت دەزانیت هیچ شتێك ئەوەندە لام خۆش نیە بە ئەندازەی ئەوەی لە پێناو تۆدا خەبات بکەم دژ بە کەسانێك کە پێغەمبەرەکەی تۆیان بە درۆ خستۆتەوە و لە شارەکەی دەریان کردووە،خوایە وادەزانم کە بەم جەنگە لە نێوان ئێمە و ئەواندا شەڕ کۆتایی پێدێت،خوایە ئەگەر شەڕێکمان لەگەلّ قوڕەیشدا ماوە بمهێلّە بۆیان،تا لە پێناوی تۆدا  لەگەلّیانا بجەنگم،خۆ ئەگەر شەڕ کۆتایی پێدێت  ئەوا ئەم ڕەگی دەمارەم بتەقێنە با پێیەوە بمرم،خوایە نەشمکوژی هەتا سەرشۆڕی بەنو قورەیزە بەچاوی خۆم دەبینم. ل٣٥٥ گولّاوی سەرمۆر.

کە جەنگی بەنی قورەیزە کۆتایی هات نزاکەی هاتە دی وخوێنی برینەکەی بەربوو شەهید بوو.جوبرائیل هات بۆ لای خۆشەویست (د.خ) فەرمووی: ئەوە کێیە مردووە دەرگای ئاسمانی بۆ کراوەتەوە و عەرشی خوای بۆ هاتۆتە لەرزە ؟ خۆشەویستیش(د.خ) یەکسەر چوو بۆ لای سەعد بینی کە گیانی سپاردووە.

بەڕاستی مرۆڤ سەرسام دەبێت کە سەعدی کوڕی مەعاز چۆن بە حەوت سالّ ئیسلامەتی گەیشتۆتە ئەو پلە بەرزە کە ئاوا بمرێت.

**سەلمانی فارسی :**

لە کاتی سەرەمەرگیدا گریا،لێیان پرسی بۆ دەگریت؟ وتی : نە بۆ دنیاو نە لە ترسی مردن ناگریم،بەڵکو بۆ دووری رێگا و کەمی تێشووم دەگریم.

ژنەکەی سەلمان دەڵێت: کە سەلمان لە سەرەمەرگا بوو وتی:ئەو دەرگایانە بکەرەوە ئەمڕۆ میوانم دێن،نازانم لە کام دەرگاوە دێنە ژوورەوە ،ئەو میسکەش بێنە بیتوێنەرەوە و بیڕژێنە بەدەوری جێگاکەمدا و بەجێم بهێڵە، کە بەجێم هێشت و هاتمەوە گیانی سپاردبوو.

**محمدی کوڕی واسیعی بەصری:**

یەکێ داوای ئامۆژگاری لێکرد ئەویش وتی: ئامۆژگاریت دەکەم وەك پاشا بیت لە دنیا و ئاخیرەتدا ،وتی : چۆن؟ وتی: لە دونیادا زاهیدبە.. یونس کوڕی عوبەید وتی: سەردانی محمدمان کرد،وتی: چی بکەم لە قسەی خەڵك کە چوار پەلم بگرن و فڕێم بەنە دۆزەخەوە.

فەزاڵەی کوڕی دینار دەڵێت:محمدی کوڕی واسیع لەسەرەمەرگدا دەیوت: سڵاو لە فریشتەکانی پەروەردگارم ولا حول ولا قوە الا باللە.. ئنجا بۆنێکی خۆش هات کە پێشتر بۆنی وا خۆشم نەکردوە ، ئنجا گیانی سپارد.

**موعازی کوڕی جەبەل:**

لەسەرەمەرگدا وتی: ڕۆژ بۆتەوە؟ وتیان: بەڵێ .

وتی: پەنادەگرم بەخوا لە شەوێك کە بەیانیەکەی دەتبەنە ئاگر ،سڵاو لە مردن سڵاو ،خوایە خۆت دەزانی کەمن لە تۆ دەترسام ،وا ئەمڕۆ ڕەجام هەیە،خوا من دنیام خۆشنەویستووە بۆ مانەوە و جۆگە لێدان و چاندنی درەخت ،من دنیام بۆ ڕۆژوو و شەونوێژ و زانست ویستووە.. ئنجا کە ئەبورایەوە و ئەهاتەوە هۆش

خۆی دەیووت:خندکاندنەکەت بمخنکێنە،بەعیزەتی تۆ خۆشم دەوێی .ئنجا گیانی سپارد.

**سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص :**

لەدە مژدە پێدراوەکەیە،کە فریشتەی گیانکێشان هاتە لای زۆر شاد و کامەران و ڕووگەش بوو، سەری لەسەر ڕانی موصعەبی کوڕی بوو،موصعەب گریا ،سەعد پێی وت :مەگری بەخوا خوا سزام نادات و من ئەهلی بەهەشتم ،ئنجا گیانی سپارد.

**بیلالی حەبەشی:**

لەسەرە مەرگدا ،ژنەکەی دەیووت: واوەیلا! بیلال وتی : ئای لەو خۆشیە،سبەی دەگەمەوە بە خۆشەویستان محمد و یارانی (د.خ).

**حوزەیفەی کوڕی یەمانی :**

لەسەرەمەرگدا وتی: (ئەمە دواسەعاتی دونیایە ، خوا خۆت دەزانی تۆم خۆشدەوێت ،بەرەکەت بخەرە گەیشتنەوەم بە تۆ) .

**موعاویە ی کوڕی ئەبو سوفیان:**

لە دوا ڕۆژەکانی تەمەنیدا،کە هەستی کرد لەشی قورس و ناساغە، چووە سەر مینبەر و وتی: (خەڵکینە هەر کەسێك دەغڵ و دان بکات، ڕۆژی درەویشی دێتە بەرو،من کاربەدەستی ئێوەم کرد و،دوای منیش لە من چاکتر نابێتە کاربەدەستتان،چونکە ئەوانەی پێش من هەموویان لە من چاکتر بوون.

یەزید ڕۆڵە ! کە ئەجەلم هات ، شۆرینم بە پیاوێکی ژیر بسپێرە ،چونکە پیاوی ژیر لای خوا پایەدارە .بابەچاکی بمشوا و بەدەنگی بەرزیش (الله اکبر) بکات،پاشان بچۆ ئەو بوخچەیەی لە گەنجینەکەدایە بیهێنەو ئەو بەرگەی کاتی

خۆی پێغەمبەر (د.خ) کردیە بەرم بیکە بە کفنم و ئەو تاڵە مووانەی خۆشەویستیش لەگەڵ نینۆکەکانیدا بیهێنە و بیکە چاوو لووتمەوە . دوایی بمخەنە ناو گۆڕەکەمەوەو معاویە بدەنە دەست (أرحم الراحمین) .

کە موعاویە لە مزگەوت گەڕایەوە سەرنجی تەمەنی دوورودرێژی زیاتر لە حەفتا ساڵی خۆی ئەدا زانی کە هیچی تیا بەستە نیە، وتی: داوەشێی بۆ چ خانە و لانەیەکی ،چل ساڵ موڵکی من بووی کەچی ئەمە حاڵمە و ئەمەش چارەنووسمە لەگەڵتا،پاشان هەناسەیەکی هەڵکێشا و بەدەنگێکی پچڕ پچڕ وتی: داوەشێن بۆ دونیا و خۆشەویستانی.

هەروەها وتی: خۆزگە پیاوێکی قورەیشی بوومایە لە (**ذي طوى**) و ئەم کاربەدەستیەم نەکردایە. ئنجا کە خۆی لەبەردەم مەرگدا دییەوە دەگریاو دەیووت : خوایە ! لەهەڵەم خۆش ببەو ، لەلادانم چاوپۆشی بکەو ، بەحیلمی خۆت لە نەزانی کەسێك ببورە کە جگە لەخۆت بەتەمای کەسی تر نیە..چونکە خۆت خاوەنی چاوپۆشی فراوانی و هیچ خاوەن هەڵەیەکیش بۆ لای خۆت نەبێت شوێن نیە بۆی هەڵبێت.

## عومەری کوڕی عبدالعزیز:

عومەری کوڕی عبد العزیز نوێژی کرد لە سەر جەنازەیەکی بەنی مەڕوان و پاش ئەوەی کە ناشتیان وتی: بوەستن ..چوو بە ناو قەبرەکانی تری بەنی مەڕواندا گەڕا ،کە هاتەوە چاوی سووربووبوو لە گریاندا..وتیان : زۆرت پێچوو؟ وتی: سەردانی قەبری خۆشەویستانم کرد،قەبری باووباپیرم ،سەلامم لێکردن وەڵامیان نەبوو!!کە گەڕامەوە قەبرەکان بە زمانی حاڵ وەك بڵێن: ئەی عومەر،ناپرسی

چیمان له خۆشەویستان کرد؟ کفنەکەیانمان ڕزاند و ،لاشەیانمان لەت لەت کرد و خوێنیانمان مژی و گۆشتیانمان خوارد و ئێسقانیانمان له یەك ترازاند.عومەر گریا و وتی: بەڕاستی دونیا کەم خایەنە و عەزیزی زەلیلە و دەوڵەمەندی فەقیرە .

جارێکی تر وتی: خەڵکینە،ئاخیرەتتان چاك بکەن دونیاتان چاك دەبێت ،ناوەوەی خۆتان چاك بکەن رووکەشتان چاك دەبێت،بەخوا هیچ بەندەیەك نیە که نەمرێت هەروەك چۆن باپیرانمان تا ئادەم مردوون!

هەندێك له بەنی ئومەییە که حەزیان بەعومەری کوڕی عبدالعزیز و دادپەروەریەکەی نەدەکرد،هەزار دیناریان دا به خزمەتکارێك تا دەرمان خواردی بکات ،کاتێك عومەر زانی کێ دەرمان خواردی کردوە ،لێی پرسی بۆ ئەم کارەت کردوە؟ وتی: هەزار دیناریان داومەتێ و ئازادم دەکەن ،وتی: دەبڕۆ هەزار دینارەکە بێنە با بیخەینە (بیت المال ) ەوە،کە هێنای وتی: دەبڕۆ با ئیتر کەس نەتبینێتەوە.

لەدوا ساتەکانی ژیانیدا خوا حافیزی له منالەکانی کرد و ڕێی دان له ژوورەکەی بچنە دەرەوە ،ئەوان چوونە دەرەوە و فاتیمەی ژنی له بەردەرگای ژوورەکەی وەستا بوو گوێی لێبوو دەیوت: سڵاو لەم ڕوخسارانە که له هی جن و ئینس ناچن،ئنجا چەند جارێك ئەم ئایەتەی (تِلْكَ الدَّارُ الْآَخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ (٨٣) القصص ) ی دووبارە کردەوە و ئیتر دەنگی نەما ،که چوونە ژوورەوە ڕووەو قیبلە گیانی سپاردبوو.

عومەر هیچی بۆ منالّەکانی بەجێنەهێشت و لە ترسی خوا دەستی نەبرد بۆ ماڵی موسڵمانان،خوای گەورەش هەقی بۆ کردنەوەو منداڵەکانی دوای خۆی دەوڵەمەند بوون.

ئەبو جەعفەری مەنصور بە عبدالرحمان ی کوڕی قاسمی کوڕی محمدی کوڕی ئەبوبەکر دەڵێت: ئامۆژگاریم بکە ،ئەویش دەڵێت : بەوەی کە بینیومە یا بەوەی کە بیستومە؟ئەویش ئەڵێت: بەوەی کە بینیوتە . ئەویش دەڵێت: عومەری عومەری کوڕی عبدالعزیز کە مرد هەریەکە لە کوڕەکانی نۆزدە درهەمی بەرکەوت لە میراتی عومەر، بێجگە لە هەندێ زەرعات و زەوی و زار.

هیشامی کوڕی عبدالمليکیش کە مرد هەر کوڕەی یەك ملیۆنی بەرکەوت. هەربەچاوی خۆم یەکێ لە کوڕەکانی عومەرم بینی کە لە یەك ڕۆژداسەد ئەسپی ئامادەکرد بۆ جەنگاوەران تا لەڕێی خودادا جیهاد بکەن،کەچی کوڕی هیشامم بینی خێر و سەدەقەی پێدەدرا. ئەمەش تەسدیقی ئەو ئایەتەیە(وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافًا خَافُوا عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللَّهَ وَلْيَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا (٩)النساء.

## سەڵاحەدینی ئەیوبی :

گەریدەیەك بە ناوی (**عبداللطيف بغدادی** ) کە لە میسرەوە چۆتە قودس و سەڵاحەدینی بینیوە ئەوا باسی دەکات (پاشایەکی مەزنم دیت ،بەگەورەیی خۆی چاوی مرۆڤی ڕوون دەکردەوە و دڵی لە خۆشەویستی پڕ دەکرد، نزیکێکی دوور،سادەیەکی گوێ لە مست،ئەوانەی لەگەڵیا بوون چاویان لێدەکرد و پێشبرکێی چاکەکاریان لەگەڵ دەکرد).

سەڵاحەدین دونیا نەویست بوو هەموو ئامانجی خزمەت کردنی ئیسلام بوو بۆیە کە مرد تەنها چل و حەوت درهەم و یەك گرام زێڕی لە پاش جێما!!شەوی دوازدەیەمی نەخۆشیەکەی کۆچی دوایی کرد، کفن و دفنەکەشی پارەیان بۆ قەرز کرد. ل ۱۳۳.۱۲۸ (صەڵاحەدینی ئەیوبی ژیاننامەی گەشترین \دکتۆر **محسن محمد** حسين ،و/عبدالرزاق بيمار )

(صلاح الدين) زوڵم و ستەمی خاچپەرستان وای لێکرد کە سوێند بخوات ژیانی خۆی تەرخان بکات لە ڕێی خوادا و بۆ ئەمەش بەرنامەی ژیانی خۆی دیاری کرد و بە پەرۆشەوە کەوتە هەوڵ و خەبات ، تەنانەت پێکەنینیان لیٚ نەئەدی چونکە ئەیوت : چۆن پێبکەنم لەکاتێکدامزگەوتی ئەقسا داگیرکرابێت .

تا ئەقسای ئازاد کرد ئەوەندە سەرقاڵ بوو نەی توانی بچێت بۆ حەج و ، دوای جەنگی -**حطين**- ویستی بچێت وتیان ئەمساڵیش مەچۆ چونکە مەترسی خاچ پەرستان هەیە کە بێنەوە سەرمان ، بەو جۆرە حەجی بۆ نەکرا تا وەفاتی کرد ، لە سەرەمەرگی دا پێکەنی و وتی: ئەمڕۆ کاتی ئەوەیە صلاح الدين پێبکەنێت ، سبەینیٚ دەگەمەوە بە پێغەمبەری خوا و پێی دەڵێم : من ڕێگای شەوڕەوی تۆم پاککردەوە لەدەست دوژمنان ئەی پێغەمبەری خوا..

## شێخ عبدالقادری گەیلانی :

هەموو ژیانی هەوڵ و کۆشش بوو بۆ هیدایەتدانی خەڵکی و بە هەزاران کەس لەسەر دەستیا تەوبەیان کرد و بە هەزارانیش موسڵمان بوون. لە ساڵی ٥٦١ کۆچی کە تەمەنی زیاتر لە نەوەد ساڵ بوو کۆچی دوایی کرد،لەدوارۆژەکانی دا عەبدولوەهابی کوڕی داوای ئامۆژگاری کرد،ئەویش وتی: (ترسی خوای

پەروەردگارت  لە دڵدا بێت،جگە لە خوا لە کەسی تر مەترسە،تکا و ڕجات بەس بۆ خوا بێت،هەموو پێویستیەکت هەر بۆ لای ئەو بەرەوە ! **پشتت هەر بەو** ببەستە،جگە لە خوای گەورە متمانە بە کەسی تر مەکە،یەکتاپەرستی سەرچاوەی هەموو شتێکە).

لەسەرەمەرگیدا بەمناڵەکانی وت (لێم دوورکەونەوە،من بە ڕواڵەت لەگەڵ ئێوەدام و لە **باطن** دا لەگەڵ غەیری ئێوەم) .دووبارە وتی: (کەسانی غەیری ئێوە لەلام دانیشتوون ئەدەبتان هەبێت جێگەیان بکەنەوە ) ، پاشان فەرمووی (هاوار بۆ حاڵتان ،من گرنگی بە هیچ نادەم تەنانەت بە مەلائیکەتی گیانکێشانیش ،ئەی مەلائیکەی گیانکێشان ،ڕێگە بە غەیری خۆت بدە با بێتە لام،با ئەو ئاگای لێمان بێت و بەسەرکارمانەوە بێت) ئنجا گیانی سپارد. ل٩١ شێخی گەیلانی/ئازاد قەزاز.

**پێشەوا شافیعی:**

بە پەنجا و چوار ساڵ خزمەتێکی گەورەی بە ئیسلام کرد،لە دوا ساتەکانی تەمەنیدا یەکێ لە قوتابیانی هاتە لای و ئەحواڵی نەخۆشیەکەی پرسی ئیمامیش وەڵامی دایەوە و وتی: (**أصبحت من الدنيا راحلاً،وللإخوان مفارقا،ولكأس المنية شارباً،وعلى الله جل ذكره وارداً،ولا والله ما أدرى روحى تصير الى الجنة فأهنئها،أو إلى النار فأعزيها**) واتە: وا خەریکم لە دونیا کۆچ ئەکەم و برایان بەجێدێڵم و،شەرابی مەرگ دەنۆشم و، بەرەو لای خودا دەڕۆم،ئیتر بەخوا نازانم ڕۆحم بەبەهەشت شاد دەبێت تا پیرۆزبایی لێ بکەم ،یا بەرەو دۆزەخ دەبرێت تا سەرخۆشی لێبکەم.

ئنجا دەستی کرد بە گریان و ئەم هۆنراوەیەی وت:

**ولما قسى قلبي و ضاقت مذاهبي جعلت الرجا مني لعفوك سلما**
**تعاظمني ذنبي فلما قرنته بعفوك ربي كان عفوك أعظما**
**ومازلت ذا عفو عن الذنب لم تزل تجود و تعفو منة و تكرما**

کاتێك کە شافیعی مرد،زۆر کەس خەویان دیبوو ،بۆ نمونە یەکێ لە خەویا حەزرەتی ئادەم کۆچی دوایی کرد بوو،تەفسیر کرا کە زانایەکی زۆر گەورە کۆچ دەکات ئەوەبوو شافیعی کۆچی دوایی .

ساڵی دوو سەد و چواری کۆچی ،شەوی پێنج شەممە لەسەر جومعە دوایەمین ڕۆژی ڕەجەب دوای نوێژی عیشا شافیعی مەلی بەرزە فڕی گیانی دایە شەقەی باڵ و ئەمانەتەکەی تەسلیم کردەوە. (ئیمام شافیعی/حبیب محمد سعید)..

## مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی:

لە ٦٠٤ کۆچی هاتۆتە دونیاوە لە شاری بەڵخی ناوچەی خۆراسان. باوکی ناوی (محمد کوڕی حوسەیینی خەتیبی بەکری) یە و بە پاشای زانایان ناسراوە و ئەچنەوە سەر ئەبو بەکری صدیق.

مەولانا بە دیوانەکەی (مەسنەوی مەعنەوی) شۆڕشێکی کرد بەسەر عیلمی کەلام و فەلسەفەدا و جڵەوی موسڵمانانی گرتەوە لە زیادەڕەوی ملکەچی بۆ حەواسەکان و هەستیارەکان و عەقڵ پەرستی.

زاهیدێکی کەم وێنە بوو هەرچی دیاری بۆ بهاتایە لای دۆست و دەسەڵاتدارانەوە دەیبەخشیەوە و کە کاتێ هەژار و کەم دەست دەبوو دەیووت : ئێستا هەست بە لێبڕان و لاوازێتی خۆم دەکەم بەرامبەر بە خودای گەورە .لەساڵی ٦٧٢ ی کۆچیدا لە شاری (قۆنیە) بوومەلەرزە بۆ هەفتەیەك دووبارە دەبۆوە خەڵکی

دەهاتنە لای و داوای دوعای خێریان دەکرد، ئەویش وتی: زەوی برسیەتی و داوای پاروەیەکی چەور دەکات ،بەم زووانەش ئەم پارووە چەورە دەگلێت و لەپاشانا ئێوەش ئەم بەڵایەتان لەسەر لادەچێت.
لەدوا ساتەکانی ژیانیدا کە نەخۆش بوو هاوەڵێکی هاتە لای و دوعای شیفای بۆ کرد،مەولانا وتی: خوا شیفای تۆش بدات، بەڵام ئاخۆ لابردنی پەردەی نێوان دوو خۆشەویست چ زیانێکی تێدا بێت ؟
لەسەرە مەرگدا وتی: ( ئەگەر تۆ باوەڕت شیرین بێت ،ئەوا مردنەکەشت شیرینە و، ئەگەر کافر و تام تاڵ بیت ئەوا مردنەکەشت کافرانە و تاڵ و گرانە).
لەساڵی **٦٧٥** بۆ دواجار بارگەی پێچایەوە بەرەو قیامەت و گەیشت بە خۆشەویستەکەی کە هەمیشە زار و گریەی بوو بۆ گەیشتن بە لیقای نەبڕاوەی .مەولانا نەئەچووە دیوانی سوڵتانەکان و کاتێکیش میرێك عوزری بۆ بهێنایەتەوە کە بۆ نەچووە بۆ لای دەیوت: پێویست ناکات بە عوزر هێنانەوە نەهاتنت لە هاتنت بەلامەوە خۆشترە. ل**٢٣-٢٦** مەولانای ڕۆمی ئازاد قەزاز.
مەولانا دەڵێت (لەبەرچیە ترسان لە مردن ؟بۆچی ئەم ڕاکردنە لە مردن؟ تۆ بە بەردەوامی لە جوڵاندای لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر ، لەنەبوونەوە بۆ بوون، وە لەبوونەوە بۆ نەبوون ،هەروەها بەردەوامی لە بەرگ داکەندن و لەبەرکردنی بەرگێکی تر... ئایا لەم ژیانی دونیایە دا مردنت تاقی کردۆتەوە ؟ کەئەگەر مرۆڤ لەم ژیانە جیابۆوە ژیانێکی نەمری بەدەست دەهێنێت و بە هیچ جۆرێك مردن نابینێت؟).
جیاوازی هەیە لە نێوان مردنی پیاوچاکان و خەڵکانی تر،پیاوچاکان بۆ جیابوونەوەیان لەم ژیانە نەبڕاوەیە،نە ئازار دەچێژن و نە خەم و پەژارەش دایان

دەگریێت ،بگرە بەوپەڕی ڕوو گەشیەوە پێشوازی دەکەن لە مردن، مردن لەلای ئەوان سەرەتای دروستبوونی ژیانێکی نوێیە،پەیامی سەرکەوتن و ڕزگاربوونە، مردن بۆ بێباوەڕان ژەهر و بەڵایەو بێبەشی و سەرزەنشتی و لەناوچوونە،بەڵام بۆ خاوەنباوەڕان شنەبای چارەسەری دەردە دارانە و هەوایەکی شێدار و پڕ لە گوڵاوە. ل٥٠ هەمان سەرچاوە.

## پێشەوا عبدالله ی کوڕی موبارەك :

ناوبراو لەسەرەمەرگدا بەنەصری مەولای وت : سەرم بخەرە سەر زەوی،نەصر گریا. وتی بۆ دەگرییت؟ وتی: تۆ لە چ ناز و نیعمەتێکدا بوویت و وا ئیستاش بە غەریبی و هەژاری سەردەنێیتەوە،ئیمام پێی وت: وس بە،من داوام لە خوا کردوە بە هەژاری بمباتەوە.

ئنجا وتی :شایەتمانم پێ بڵێ،تا قسەی تر نەکەم دووبارەی مەکەرەوە لێم ،بۆ ئەوەی دوا قسەم بێت.

پاش وتنەوەی چەند جار شایەتمان ،چاوی هەڵبڕی و بە پێکەنینەوە وتی: (**لمثل هذا فليعمل العاملون**).

هەروەهازانای گەورەی  قازی شاری حەما مەحمودی کوڕی ئەحمەد ی شافیعی ناسراو بە ئیبن خەتیبی دەهشە ،لەساڵی ٨٣٤ ی کۆچیدا وەفاتی کرد،لەسەرەمەرگدا بە زەردەخەنەوە وتی : (**لمثل هذا فليعمل العاملون**).

هەروەها صالح کوڕی ئەحمەدی حیمصی،کەسێکی خواناسی پارێزگار بوو،داوایان لێکرد کە شەونوێژ کەمبکاتەوە،ئەویش وتی: چۆن موناجاتی پەروەردگارم بە دووسەعات شەونخونی نەکڕم؟؟!

له پێنج ساڵدا ۱۵۰ جار خەتمی قورئانی کردو له دوا ساتەکانی تەمەنیدا ئەم ئایەتەی دووبارە دەکردەوە (سلام علیکم بما صبرتم،فنعم عقبی الدار) الرعد ۲٤. له دوا خولەکەکانی گیانکێشانیدا ناوی خوا (الله) ی دووبارە دەکردەوە. ناوبراو ساڵی ۱۳٦۲ کۆچی له شام کۆچی دوایی کرد.

## ئیبن تەیمیە :

له بەندیخانەدا کۆچی دوایی کرد له ساڵی ۷۲۸ی کۆچیدا و له سەرەمەرگ و دوا هەناسەیدا وتی: إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ (٥٤) فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِنْدَ مَلِيكٍ مُقْتَدِرٍ (٥٥)القمر

## سوڵتانێکی هیندستان :

شێخ ئەبوالحسن الندوی باسی سوڵتان موزەفەر کوڕی مەحمودی کوجەراتی دەکات له ساڵی ۹۱۷ کۆچیدا فەرمانڕەوا بووە له هندستان ،ئەم سوڵتانە خواناس و دادپەروەر و زانا بووە،دوارۆژی ژیانی که جومعە بووە له دەمەونیوەڕۆدا دەستنوێژی شت و دوو ڕکات نوێژی سوننەتی کرد و ئامۆژگاری ماڵ و مناڵ و ژنەکانی کرد که ئارامگر بن و به خوای سپاردن،ئنجا به زانایەکی وت:خوا تۆی به زانست پایەدار کردووە بۆیە حەزدەکەم له سەرەمەرگمدا لەلامبی و یاسینم بخوێنی و بەدەستی خۆت بمشۆیت و گەردنم ئازاد بکە.

که بانگی یەکەمی جومعەی دا وتی: پشت بە خوا نوێژی نیوەڕۆم لای ئێوە دەکەم و عەسریش لای پەروەردگارم دەبم لە بەهەشتا.

ئنجا ئامادەبوانی ئیزن دا بچن بەلای نوێژی جومعەکەیانەوە و بۆ خۆشی لە شوێنی تایبەتی نوێژەکەیدا نوێژی نیوەڕۆی کرد و دوعای کرد وتی: رَبِّ قَدْ آَتَيْتَنِي مِنَ الْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِنْ تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَنْتَ وَلِيِّي فِي الدُّنْيَا وَالْآَخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ (١٠١)یوسف

ئنجا شوێنی نوێژەکەی ناو کۆشکی بەجێهێشت و وتی: ئەتدەمە دەست خوا (أستودعك الله).پاشان لەسەر جێگاکەی ڕووە و قیبلە پاڵ کەوت وتی: (لا إله إلا الله ،محمد رسول الله ) وگیانی دەرچوو .لەوکاتەدا وتاربێژ لەسەر دوانگە دوعای بۆ دەکرد.

**ئەبوبەکر کوڕی مەسعود ی کاسانی :**

زانای بەناوبانگی حەنەفی ،خاوەنی پەڕاوی (**بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع**) کە ئەم پەڕاوەی شەرحی پەڕاوی (التحفه) ی عەلائەدینی سەمەرقەندی یەو ئەم کتێبەی کرد بە مارەیی کچی عەلائەدین،کاتێك کچەکەی خواست ، بۆیە وتراوە (شرح تحفته و تزوج ابنته).

لەسەرەمەرگدا ئەم زانایە کەوتە خوێندنی سورەتی ابراهیم و کە گەیشتە ئایەتی يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آَمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآَخِرَةِ وَيُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ (٢٧) گیانی سپارد.

**شێخ ئەحمەد کوڕی عەبدول لەتیفی تونسی :**

زانایەکی بەناوبانگ بووە و چۆتە دیمەشق و لە ساڵی ١١٢٦ کۆچیدا وەفاتی کرددوە،لەسەرەمەرگدا بە محمدی کوڕی و بە شێخ **عبداللطیف** العمری وت: ئێوە بە شایەت بن کە من شایەتی ئەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە خوا نەبێ کە هاوەڵی نیە و محمدیش بەندە و نێردراویەتی و هەرچی ئەو پێغەمبەرە هێناویەتی هەقە و، بە هەشت حەقە و دۆزەخ هەقەو، قیامەتیش بێگومان دێت و خوا مردوان زیندوو دەکاتەوە.

ئنجا ئەم ئایەتەی خوێند (شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (١٨) آل العمران) کە تەواوی کرد گیانی سپارد.

**ئیبن حەنبەلی شافیعی :**

زانایەکی ناودار بوو، بیست ساڵ وتاربێژی مزگەوتی حەڵەب بوو،ساڵی ٧٧٤ ی کۆچی وەفاتی کرد، لەسەرەمەرگیدا سورەتی (رعد) ی خوێندو کە گەیشتە ئایەتی (مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ أُكُلُهَا دَائِمٌ وظِلُّهَا تِلْكَ عُقْبَى الَّذِينَ اتَّقَوْا وعُقْبَى الْكَافِرِينَ النَّارُ (٣٥)الرعد ،کۆچی دوایی کرد.

**محمد کوڕی ئەحمەدی عەلوینی :**

ئیمامی مالیکیەکان بوولە سەردەمی خۆیدا و، ناسرابوو بە شەریفی تەلمەسانی لە ساڵی ٧٧١ کۆچیدا وەفاتی کردووە، کە ئەگاتە تەفسیری ئایەتی

(**يستبشرون بنعمة من الله**) **آل عمران ١٧١**، بۆ ١٨ ڕۆژ نەخۆش کەوت و مرد.کوڕەکەی دەڵێت لە کاتی نەخۆشەکەیدا قورئانەکەی ماچ کرد و خستیە سەرچاوی و وتی(چۆن لە دنیادا بەم قورئانە سەربەرزت کردوم،ئاواش لە قیامەتدا سەربەرزم بکە).

**ئیمام سەرهەندی :**

نوێخوازی هەزاری دووەم لە ساڵی **١٥٦٣**لە سەرهەند لە هیندستان لە دایك بووە و زانایەکی گەورە بوو کە توانی بە هەوڵ و کۆششێکی زۆر هیندستان بێنێتەوە ژێر ئاڵای ئیسلام و ڕزگاری کرد لە بورهمیەکان و فەلسەفەی (وحدە الادیان) .

لە دوارۆژەکانی تەمەنیدا کە تەنگەنەفەسی زۆری بۆ دەهێنا دەگریا و دەیووت (اللهم الرفیق الاعلی)،خوا بمبەرەوە بۆ لای خۆت من تینووی دیدارتم،دەمێکە چاوەڕێی ئەو ڕۆژەم بە تیشکی نورت شاد بم و ئەو فرمێسکانەی لە پێناو تۆیا ڕشتوومە هەر دڵۆپێکی لە ناو صەدەفی بەندایەتیدا ببێتە مرواریەك و نرخی منی لەبارەگای پیرۆزی خۆتدا پێی بەرزبێتەوە .

کوڕەکانی لێیان پرسی بۆ دەگریت؟ وتی: شەوقی گەیشتنمە بە خودا . شەوێکیان لەشەو نوێژدا پێی وتن: ئەمە دواهەمین شەونوێژە کە دەیکەم . هەرواش دەرچوو ئەوە دوا شەو نوێژی بوو بۆ بەیانیەکەی کۆچی دوایی کرد.

ل٧٦ ئیمامی رەببانی/ئازاد قەزاز.

**عومەر موختار :**

ساڵی ١٨٦٢ زایینی لە دایك بووە لە لیبیا و باوکی لە حەج ناگەڕێتەوە و کۆچ دەکات وعومەر بە هەتیوی گەورە دەبێت . کەسێکی خواناس بوو زۆربەی کات

دەست بە دەست نوێژ بوو، هەردەم سوننەتی چێشتەنگاو و شەونوێژی دەکرد. ئەو چەند سەعاتێکی کەم دەنووست .

لە نامەیەکیدا ناوبراو دەڵێت: (ئێمە لە فڕۆکەکانی دوژمن و تانك و تۆپ و سوپای ئیتاڵیا و حەبەش و سبایس ناترسین، ئێمە لە ژەهر کردنە بیرەکانمان و ژەهراوی کردنی بەروبوومەکانمان ناترسین لەسەر زەوی،ئێمە لەسەربازانی خواین ، سەربازانی خواش سەرکەوتون) .

لە ساڵی ۱۹۱۱ ەوە دژ بە ئیتاڵیەکان جەنگا ،سەردانێکی میسری کردو هەندێ لە شێخەکانی هۆزەکەی کە لە میسر بوون و ویستیان ساردی بکەنەوە لە جیهاد و گوایە سنۆسیەکان دەتوانن کەسێکی تر بخەنە جێی، ئەمیش وتی: (ئەوەی ئەو قسەیەم بۆ بکات خێری منی ناوێت،چونکە ئەوەی ئەیکەم ڕێگەی خێرە و نابێ کەس بڵێ مەیکە، هەرچی ئەوەش بڵێ دوژمنمە).

عومەر موختار زۆر جار دوعای دەکرد ( خوایە لە پێناوی ئەم قەزیە پیرۆزەدا بمرم) .وە سوور بوو لەسەر مانەوە لە لیبیا داو وتی: (ئەم وڵاتە بەجێناهێڵم تا دەگەمەوە بە پەروەردگارم ،مردنیش لە هەموو شتێك لێم نزیك ترە و هەموو خولەکێك چاوەڕێم بێت) . ل۳۰

پێیان وت :جیهاد بە جێبهێڵێ و بچێ بۆ حەج ،وتی: (نارۆم و ئەم خاکە بەجێناهێڵم تا فریشتەکانی خودا دێن،پاداشتی حەجیش گەورەتر نیە لە پاداشتی بەرگری لە خاك و ئاین و عەقیدە).

پاش نزیکەی بیست ساڵ جیهاد بە شاخ و کێوو دەشتەوە شێری نەبەردی ئیسلامیان دەستگیر کردوو لە دادگایەکی کارتۆنیدا دادگاییان کرد و لە ڕۆژی ۱٦ ی ئەیلول ی ۱۹۳۱ سەعات ۹ ی بەیانی لەسێدارەیان دا.

خەڵكێكی زۆریشیان كۆكردەوە  بۆ چاوترساندنیان، فڕۆكەی جەنگی زۆریش بە ئاسمانەوە بوون،شێخی موجاهیدیش لەسەر خۆ هەنگاوی دەنا بەرەو پەتی سێدارە بەدەنگێكی نەرمی ناسك بانگی ئەدا،كە پەتەكەشیان كردە گەردنی فەرموی : (**یا أیتها النفس المطمئنة ،أرجعي إلی ربك راضیة مرضیة** )الفجر .
خوای گەورەش دوعاكەی گیرا كرد و ئاواتەكەی هێنایە دی كە لە پێناو قەزیە پیرۆزەكەیدا ،لە پێناوی خاك و دین و عەقیدەدا شەهیدی كرد بە نسیبی ل١٧٣ (الشیخ الجلیل عمر المختار/ د. الصلابی) .

**بانگبێژێك:**

پیاو باشێك لە دێیەك بانگبێژی مزگەوت بوو،باخ و باخاتی هەبوو و هەردەم خێری لێدەكرد ،دوای چوارڕۆژ بە نەخۆشی كۆچی دوایی كرد لەسەرەمەرگدا (أستغفر الله و لا إله إلا الله) ی دەوتەوە،لەپڕ دەستی بەرز كردەوە وەك ئەوەی تەوقە بكات لەگەڵ كەسێكدا وتی: سڵاو لە هاوەڵ و خۆشەویستم ،ئنجا گیانی سپارد.

**عبدالله تاهەرتی:**

پیاوێكی خواناس بوو ،جارێكیان نەخۆش دەكەوێت و بەتەمای نامێنن، دەڵێت: لەم نەخۆشیەدا نامرم لە نەخۆشیەكی ترمدا چاوەڕێی مردن بن. برادەرێكی دەڵێت: وادەزانم دووعای كردبوو لە خەودا ئەمەی پێوترا بوو، ئەم پیاوە باشە لەسەرەمەرگدا وتی : (وەرە ژوورەوە فریشتەی گیانكێشان)  بە

زەردەخەنەوە سەیری لای ڕاستی دەکرد، ئێمەش بۆنێکی خۆشمان کرد و گیانی سپارد.

### شێخ نەجمەددینی محمد غوززی :

موحەدیسی شام بوو،زانایەکی گەورە بوو خزمەتێکی باشی کرد بە دینی خوا ،دوو ڕۆژ پێش وەفاتی سەردانی باخە وەقفەکانی باپیری کردو گەردنی خۆی بە جووتیارەکان ئازاد کرد ،ئنجا ڕۆژێك پێش مردنیشی سەردانی کەس و کاری کرد و گەڕایەوە ماڵەوە نوێژی ئێوارەی کرد و ویردەکانی خوێند و پرسی کەی عیشا دەبێت.

بەردەوام بوو لە وتنی لا إله إلا الله و ڕوو لە قیبلە پاڵکەوت،پاشان گوێیان لێبوو وتی: تو ئەو خوایەی کە ناردووتی نەرم و نیان بە لەگەڵما ..کە چوونە ژوورەوە بۆ لای ڕۆحی دەرچووبوو!

### شێخ عبدالقادر کوڕی ئەبی ساڵح عبدالله کوڕی جنکی جیلی حەنبەلی :

زانایەکی گەورە بوو،خەڵکی گەیلان بوو،ئیمامی حەنبەلیەکان بوو لەسەردەمی خۆیدا ،زۆر لە خەڵکی بەغداد لەسەر دەستی تەوبەیان کرد و کەراماتی ئاشکرای هەبووە، کاتێك لەنەوەد ساڵیدا دەمرێت گوێیان لێی بوو وتی: سەلامتان لێبێت،سەلامتان لێبێت،بەلەسەرخۆیی بەنەرمی ، وا هاتم ،واهاتم ..ئنجا گیانی دەرچوو.

### ئیبن عەساكر :

موحەدیس و مێژوونووسی شام لەدوا ڕۆژی تەمەنیدا نوێژی نیوەڕۆی كرد ،چاوەڕیی عەسر بوو،دەستنوێژی شتەوە و شایەتمانی هێنا بە دانیشتنەوە و وتی: ڕازیم كە خوا پەروەردگارمە و ئیسلام دینمە و محمد پێغەمبەرمە ،خوا بەڵگەی دامیَ و دەستی گرتم لە كەوتن و رەحمی بە غەریبیم كرد.. ئنجا وتی: سەلامتان لێبێت.. دیار بوو مەلائیكەتی بینی و گیانی سپارد.

دەڵێن :فریشتەی گیان كێشان كە دێتە لای پیاو باشێك گیانی بكێشێت ،دەڵێ : سڵاو ،بەخوا من پەنجا ساڵە خۆم بۆئەمڕۆ ئامادە دەكەم.

### ئەبی الخیر عبدالله كوڕی عمر البیضاوی:

لە تەبرێز زانایەكی گەورە بوو لەسەرەمەرگدا لە هۆش خۆی دەچێت، كە دێتەوە هۆش خۆی بە فەخرەدینی كوڕی دەڵێت: مژدە بێت كوڕی خۆم،مژدەیان دامیَ كەلەگەڵ پێغەمبەراندا بەشم هەیە ئنجا چاوی داخست و گیانی سپارد.

### پێكەنینی دوا هەناسە :

پیاو باشێك لەسەرەمەرگدا پێكەنی،وتیان :بۆ پێكەنیت؟ وتی: لەخۆشی ئەوەی كە ئەچمەوە بۆ لای كەسێك چاوەڕێی خێری لێدەكرێت و ڕزگارم دەبێت لەوانەی كە ئەمین نیم لەشەڕیان.

*زانای شام مەکحول کە هەموو دونیای تەی کرد لە ڕێی فێربووندا لەسەرە مەرگدا لێیان پرسی بۆ پێئەکەنیت؟ وتی: چۆن پێنەکەنم کە جیادەبمەوە لەوانەی حەزەرم لێدەکردن و ئەچم بۆ لای ئەو کەسەی کە هیوام پێیەتی.

## تامەزرۆی گەیشتن بەخوا :

*ئیمام زەکەریا کوڕی عەدی التمیمی،کە زانایەکی گەورە بوو،دانیشتوی بەغداد لە ساڵی ٢١١ کۆچی کە وەفاتی کرد لەسەرە مەرگدا وتی: خوایە من موشتاقی تۆم !

*ئەحمەدی کوڕی النوری،کە جونەیدی بەغدادی زۆر بە گەورە سەیری دەکرد ،لەساڵی ٢٩٥ کۆچیدا کە مرد لێیان پرسی حەزت لە چییە؟ وتی: حەزێکی زۆر گەورەم هەیە،ئەویش ئەوەیە کە بە دیداری خودای گەورە شاد بم.ئنجا هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و گیانی سپارد. لە خەودا بینیان ، وتیان :خواوەند چی لێکردی؟ وتی: هەرچی هەبوو لە لایەك و ئەوەی سوودی هەبوو بۆم ڕکاتەکانی شەونوێژ بوو.

## ئەبو حامیدی غەزالی :

بەیانی دووشەممە دەست نوێژی شت و نوێژی کرد و وتی:کفنەکەم بۆ بهێنن، کە بۆیان هێنا ماچی کرد و خستییە سەر چاوی و وتی :گوێڕایەڵ و فەرمان بەرم بۆ چوونە خزمەت مەلیك،ئنجا قاچی درێژ کرد و ڕووی کردە قیبلە و پێش ڕۆژ هەڵاتن گیانی سپارد لە ساڵی ٥٠٥ ی کۆچیدا .

ڕەحمەتی چەند دێڕ هۆنراوەی پێش مردنی نوسیبوو کە تیایدا دەڵێت :

قل لإخوان رأوني ميتاً　　فبكوني ورثوا لي حزنا
أتظنون بأني ميتكم؟　　لست ذاك الميت والله أنا
أنا في الصور و هذا جسدي　　كان بيتي و قميصي زمنا
أنا درّ قد حواه صدف　　كنت ممحونا فعفت المحنا
أنا عصفور وهذا قفصي　　طرت عنه وبقي مرتهنا
أحمدالله الذي خلصني　　وبنى لي في المعالي سكنا

**ئەبو هورەیرە :**

لە ئەهلی صوففە بوو، هەژارو کەم دەست بوو ،خۆشەویست(د.خ) شتی هاتبووە دەست بە سەریاندا دابەشی کرد ،ئەبوهورەیرە وتی: من ئەوەم ناوێ ، دەمەوێ ئەوەم فێر بکەی کە خوا فێری کردووی . خۆشەویستیش(د.خ) دوعای بۆ کردو توانایەکی سەرسوڕهێنەری لەبەر کردنی پەیدا کرد ،شەش هەزار فەرموودەی ڕیوایەت کردووە ، لەسەرەمەرگدا وتی: ئای بۆ کەمی تێشوو، دووری ڕێگای سەفەرمان .

**ئەنوەر جوندی:**

برایەکی خواناسی میسرییەو نوسەرو بانگخوازێکی گەورەیە،زۆربەی کات دەستی بە دەست نوێژ بوو،چەندەها پەڕاوی هەیەو پاش خوێندنی ئابوری و کارگێڕی چووە زانکۆی ئەمریکی تا باشتربتوانێ وەڵامی گومانی دوژمنان بداتەوە ،لە کۆتایی ژیانیدا نەخۆش کەوت و لە دوا هەناسەکانیدا وتی :(ئەی پێغەمبەری خوا ، من ئەنوەر جوندیم ، وا هاتم بۆ لات لە خارووی میسرەوە ).

## حەسەنی بەسری :

پیاوێکی خواناسی بانگخوازی بۆ خوا سوڵحاو بوو، لەسەرە مەرگیدا (انا لله وانا اليه راجعون) ی دەووت ،ئنجا لە هۆش خۆی چوو پاشان کە هاتەوە هۆش خۆی وتی : بێدارتان کردمەوە ،من لە بەهەشت و باخات و جێ و ڕێیەکی خۆش و بە ڕێزدا بووم .(دیارە پیشانیان داوە) پاشان بە یەکجاری گیانی سپارد.

## زانای خواناس خەلیفە ئەماسی :

کەسێکی تێکۆشەر بوو بۆ دینی خوا ، لەسەرە مەرگدا دەیووت :ئەو پلەو پایانە چەند چاکن ،ئەو حوری عەینانە چەند نەرم و نیانن ، بانگم دەکەن بۆ بەهەشت ،خوایە زوو بمگەیەنە بەو پلەو پایەو مەقاماتە . پاش کەمێك لەم قسانە کۆچی دوایی کرد.

## ئیبن عەتتار :

پیاوێکی نورانی ئەدیب بوو ،لە سەرەمەرگدا بەردەوام زیکری خوای دەکرد و کە خەریك بوو دوا هەناسە بدات بە زەردەخەنەوە وتی : باخ وباخات و سەوزایی دەبینم ، ئنجا گیانی سپارد .

## عبداللەی کوڕی سەعد کوڕی ئەبو سەرح :

سەرکردەیەکی بە توانا بوو ،برای شیری عوسمانی کوڕی عەففان بوو،زەمانی فیتنە بەشداری نەکردو چوو لە شاری ڕەملە لە فەلەستین دانیشت .کاتێ هەستی بە نزیکی ئەجەلی کرد وتی خوایە دوا ئیشم بکە بەنوێژی بەیانی ،دەست نوێژی شت و نوێژی بەیانی کرد کە سەلامی دایەوە بە لای چەپدا گیانی سپارد.

## عامری کوڕی عبداللەی کوڕی زوبەیری کوڕی عەوام:

کە لەسەر جەنازەیەك دەوەستاو دوعای دەکرد ئەوەندە کاریگەری هەبوو لەسەری عەباکەی لە شانی دەکەوتە خوارەوە بە بیّ ئەوەی بە خۆی بزانێت .

عامر لە دوا ساتەکانی تەمەنیدا گوێی لە بانگ بوو،وتی دەستم بگرن بۆ مزگەوت ، وتیان تۆ زۆر ناساغیت ؟ وتی :چۆن ئەتوانم جوابی بانگی خوا نەدەمەوە ؟ دەستیان گرت و لە مزگەوت لەگەڵ ئیمامدا ڕکاتێکی نوێژی ئێوارەی کردو گیانی سپارد.

## مردن لە مزگەوتداو لە نوێژدا :

عبداللەی سولەمی قورئان خوێنێکی دیاربوو ، خەڵکی فێری قورئان ئەکرد لەبەر گەورەیی فەرمودەکەی خۆشەویست (د.خ) کە دەفەرموێت (خیرکم من تعلم القران وعلمه) بخاری ، لە نەخۆشیەکەیدا سەردانیان کردو دڵیان دایەوە ،ئەویش وتی: هیوام بە خوا زۆرە هەشتا ڕەمەزان بۆی بە ڕۆژوو بووم .

لە مزگەوت دا بوو کە گیانی ئەدا وتیان : بۆ ناچیتە ناو جێگاکەتەوە و پاڵ بکەوی؟ وتی: من حەز دەکەم لەمزگەوت داو لەچاوەڕوانی نوێژدا بمرم، خۆشەویست (د.خ)دەفەرموێت (**لا يزال احدكم فى صلاة مادام في مصلاه ينتظر الصلاة ،والملائكة تقول اللهم اغفر له، اللهم ارحمه** ) .

عبدالرحمان کوڕی ئەبان کوڕی عوسمانی قوڕەیشی ،زەهەبی لە بارەیەوە دە فەرموێت (عبدالرحمان کەسێکە بۆ خەلافەت دەشێت) پیاوێکی خواناس و دەوڵەمەند بوو خەڵکانێکی زۆری دەکڕی و پۆشتەی دەکردن و ئازادی دەکردن ،

دەیووت بۆ سەرەمەرگم باشە ،ئیبن جوزی دەڵێت (عبدالرحمان لە مزگەوتدا نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد گیانی سپارد) .

خەیر نەساج هاوەڵی جونەیدی بەغدادی کە پیاوێکی خواناس بوو،لەکاتی نوێژی ئێوارەدا لە هۆش خۆی دەچێت ،کە دێتەوە هۆش خۆی سەیری سوچێکی مزگەوتەکە دەکات و دەڵێت : بوەستە سەلامەت بیت ،تۆ بەندەیەکی فەرمان پێدراویت و منیش هەروام ،ئەوەی تۆ فەرمانت پێدراوە کە گیان کێشانی منە لە دەستت دەرناچێت ،بەلاّم ئەوەی من فەرمانم پێدراوە کە نوێژی ئێوارەیە دە چێت . ئیتر ئاویان بۆ هێناودەست نوێژی شت و نوێژی ئێوارەی کردو پاڵ کەوت و چاوی نوقاند و شایەتمانی هێناو کۆچی دوایی کرد .

لە خەودا بینیان وتیان :خوا چی پێکردی؟ وتی: لەوە مەپرسن ،من پشووم داو رزگارم بوو لە دەست دونیاکەتان.

*ئەبو سەعلەبەی خەشنەیی هاوەڵی خۆشەویست بوو(د.خ) ،دەیوت:من هیوادارم لەسەرەمەرگدا خوا وەك ئێوە نەمخنکێنێ ... لە شەونوێژ و لە سوجدەدا گیانی سپارد،کچەکەی خەوتبوو لە خەویا بینی باوکی مردووە ،لە خەو ڕاپەڕی و لە دایکی پرسی کوا باوکم؟ وتی: لەسەر بەرماڵەکەی شەونوێژ دەکات،کەچوو بۆ لای گیانی سپاردبوو لە سوجدەدا؟

ئەبو حەنیفەی نوعمان کە کەوتە حاڵەتی گیانکێشانەوە چووە سوجدەوە و خوا لە سوجدەدا گیانی کێشا.

ئیمامی مزگەوتی گەورەی کۆیە بۆی گێڕامەوە ، کە وتاربێژێکی مزگەوتی گەورەی کۆیە کە ناوی مەلا محەمەد بووە ، دوای ئەوەی سەلامی نوێژی جومعە ئەداتەوە گیانی دەسپێرێت .

## سابتی بەنانی :

زانایەکی خواناسی گەورە بوو،ئەنەسی کوڕی مالیك لە بارەیەوە دەڵێت: سابت کلیلی خێرە . سابت دەڵێت: بیست ساڵ زەحمەتم کێشا لەگەڵ نوێژدا و هەوڵم دا تا بیست ساڵی دوای ئەوە خۆشیم بینی لە نوێژ ،لەسەرەمەرگدا محمدی کوڕی ویستی تەلقینی بە لا إله إلا الله بکات پێی وت: وازم لێبێنە ،خۆم ویردەکەم دەخوێنم و گیانی دەرچوو. دوعای کرد خوایە ئەگەر ڕێی کەست داوە لە قەبرەکەشیا لە بەرزەخدا نوێژ بکات ئەوە ڕێی منیش بدە نوێژ بکەم .

## سەرەمەرگ و قورئان خوێندن:

جونەیدی بەغدادی کە خواناسێکی گەورە بوو، لەسەرەمەرگدا ئەیویست قورئان خەتم بکات ،وتیان: کەی ئێستا کاتی ئەوەیە؟؟ ،وتی:جا کێ بە هێندەی من پێویستی پێیەتی ،وا دەفتەری کردەوەکانم دادەخرێت. قورئانی خەتم کرد و حەفتا ئایەتی لە سورەتی (البقرە)ی خوێند و لە ڕۆژی جومعەدا گیانی سپارد.

برادەرێکی لە سەرەمەرگدا دەچێتە لای و سەلامی لێدەکات وەڵامی ناداتەوە دوای سەعاتێك وەڵامی دایەوە و وتی: ببورە ویردەکەم تەواو دەکرد،ئنجا رووی کردە قیبلە و وتی :الله اکبر ،گیانی سپارد.

*عامر کوڕی سەید عوسمان شێخی قورئان خوێنانی موجەمەعی مەلیك فەهد بوو (للمصحف الشريف). کە لە حەوت ساڵی کۆتایی ژیانییدا ژێیەکانی دەنگی قورگی نەمان ،بەوەشەوە کۆڵی نەئەدا و قوتابی فێری قورئان دەکرد. لە نەخۆشی مردنەکەیدا ئەوەی سەیر بوو بۆ سێ رۆژ دەنگی بەربوو،هەموو

قورئانی به دەنگێکی خۆش خوێند لەسەر جێگاکەی لە خەستەخانە و گیانی سپارد.

شێخی قورئان خوێنانی مەغریب ،حاجی مەکی کوڕی عبدالسلام ی کیرانی فاسی،هەموو ژیانی لە خزمەتی قورئاندا بوو، لە خزمەتی هەژار و نەداراندا بوو تەنانەت هەندێ پێی دەوت: حاتەمی مەغریب !

عەللامە الصادق کوڕی کیران دەڵێت: لە سەرەتای نەخۆشیەکەی حاجی مەکیدا خەوم بینی،لە خەومدا خەڵکێکی زۆر کۆبووبوونەوە و لە کەش و هەوایەکی ئیمانیدا ماسی ونان لە مەدینە دابەشکرا بەسەریانا و خەڵکەکە چاوەڕێی کەسێکیان دەکرد،لەپڕ کەسێك هاتە ژوورەوە و وتی: پێغەمبەری خوا خۆی سەرەوکاری ئیشەکانی حاجی مەکی دەکات.

لەساڵی ۱۹۹۵ ەوە ناوبراو نەخۆش کەوت و نەیدەتوانی لەماڵ بێتە دەرەوە بەوەشەوە لەماڵەوە سەرەوکاری ئەوانەی دەکرد کە دەچوون بۆ ماڵیان بۆ فێربوونی قورئان. لە کۆتایی ژیانیدا شەهادەتی بەدەنگی بەرز دەووت و سڵاواتی ئەدا و ئنجا ئەم ئایەتەی دووبارە دەکردەوە تا گیانی سپارد (وبالحق أنزلناه وبالحق نزل). لەبەیانی ڕۆژی پێنج شەممە ۱۵ ی مارس ی ۲۰۰۱ دا.**سەرچاوەی ئەم بەشە(مرحبا بملائکة ربی،دکتور محمد بن عزوز)**.

## ئافـرەتێـکی بانـگخـواز :

دایکی سەعید خەڵکی وڵاتی مەغریبە و ئافرەتێکی چست و چالاك بوو، ئەوەندەی نەمابوو بگاتە پشتێنی ڕەش لە کاراتیدا، لە خوێندنەوەشدا توانایەکی

باشی هەبوو، کتێبخانەیەکی گەورەی هەبوو لە ماڵەوەو بەردەوام گۆڤاری (العربي) کوەیتی دەخوێندەوە.

دوو کوڕی هەبوو بەناوی **محمد** و سعید، کاتێك **محمد** تەوبە دەکات و دەبێتە موسوڵمانێکی ڕاستەقینە، کاردەکاتە سەر دایکیشی و ئەمیش تەوبە دەکات و دەبێتە بالاپۆش و قورئانێکی باش لەبەردەکات، تەنانەت لەیەك ڕکاتی شەونوێژدا هەموو سورەتی بەقەرەی لەبەر خوێندووە.

دایکی سەعید کەوتە بانگەواز کردن بۆدینی خوا و دەرسی هەفتانەی بۆ ئافرەتان دانا لە ماڵەوە و بە دەیان ئافرەت بوونە بالاپۆش و، هەمیشە بەرگی زیادەی بالاپۆشی لە ماڵەوە دانابوو، تا ئەو ئافرەتەی دەچوو بۆ دەرس و قەناعەتی لا دروست دەبوو، یەکسەر بەجلی سەرتاپا و سەرپۆشەوە لە ماڵیان دەهاتە دەرەوەو جلێکی گونجاوی پێشکەش دەکرد.

ئەم ئافرەتە هەمیشە دڵی لای سەعیدی کوڕی بوو، کە سەرقاڵی هونەر و دوور لە خوایی بوو، زۆر دەگریاو لەخوا دەپاڕایەوە کە هیدایەتی بدات و ببێتە بانگخوازێك بۆ ڕێ ی خوا ، بە تایبەتی کاتیێ چوو بۆ حەج لە کێوی عەرەفە دوعای هیدایەتی زۆری بۆ کرد. . .

خوای گەورە دوعاکەی گیرا کرد، کە گەڕایەوە لە حەج سەعید گۆڕدرا و کەوتە دیراسەی ئیسلام و بووە بانگخوازێکی دیار و بە توانا.

خوای گەورە بە شێرپەنجە تاقیکردەوەو سنگیان بۆ هەڵگرت سەعید بە پزیشکەکەی دایکی وت: حاڵی دایکم چۆنە؟؟ وتی: درەنگ هاتووە بەدەم نەخۆشی یەکەیەوە و بە لەشیا بڵاوبۆتەوە، تۆ ئیمانت بە قەزاو قەدەرە و ئەمەلی ژیانی لەسەدا دووە، بەڵام دیارە ژیان و مردنیش بەدەست خوایە.

دایکی سەعید داوای کرد کە بیبەن بۆ مەککە، بۆئەوەی لەوێ ئاوی زەمزەم بخواتەوەو داوای شیفا بکات لەخوا لەسەر فەرمودەکەی حەزرەتﷺ کە دەفەرمویێت (زمزم لِما شُرِبَ له) . . .

سەعیدیش دایکی و هاوسەرەکەی و منداڵەکانی برد بۆ مەککە کە کۆتایی مانگی شەعبان بوو، هەموو مانگی ڕەمەزان لەوێ بوون، بە عەرەبانەی کەم ئەندامەکان هاتوچۆ و تەوافی بەدایکی دەکرد، دایکیشی بە کوڵ دەگریا و دوعای دەکرد خوا شیفای بدات، دوای ڕەمەزان تەندروستی بە جۆرێك باش بوو بەپێی خۆی دەڕۆیشت و نەخۆشی یەکەی لەسەر هەڵگیرا.

دایکی سەعید کە خوا وەڵامی دوعاکەی دایەوە و سەعیدی بۆ هیدایەت دا و، وەڵامی دوعاکەی دایەوە و شیفای بۆ نارد، هەموو ژیانی تەرخان کرد بۆ بانگەواز و هەمیشە دوعای دەکرد: (اللهم إني أسألك شهادة في سبيلك و ميتة في بلد رسولك) کە ئەمەش کاتی خۆی دوعای حەزرەتی عومەر بوو ، دیارە عومەر کاتی خۆی هاوەڵان پێیان دەوت باشە چۆن دەتەوێ شەهیدبیت و لە مەدینەش بیت ،ئەوەبوو ئاواتەکەی هاتەدی و لە مەدینە شەهید بوو. . .

دایکی سەعیدیش خوای گەورە نزیکەی یانزە ساڵێکی تر تەمەنی پێ بەخشی، لە هاوینی (٢٠٠١) دا مەغریب زۆر گەرم بوو، سەعید کە چوو بوو بۆ سەردانی پێی وت: هاوینی داهاتوو پشت بەخوا ئێرکۆندیشنت بۆ دائەنێم. . . دایکیشی وتی: هاوینی داهاتوو؟! بۆ من دەژیم تا هاوینی داهاتوو؟ نا، نا. . . کوڕم من واهەست دەکەم کە ئەجەلم نزیکە، داواکارم لەخوا کە لە مەککە وەفات بکەم و ئاخر خێر بم، ئنجا دەستی کرد بە گریان.

ئەمەی وت لە کاتێکدا مەغریب هەزار کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە، بەڵام خوا بەدەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا و هەروەك لە فەرمودەی قودسی دا هاتووە خوای گەورە دەفەرموێت: (أنا عند ظن عبدي بي) . . .
پاش چەند مانگێك هەواڵیان دا بە سەعید کە لە قطر دائەنیشت، کە دایکی لە خەستەخانە کەوتووە ، جا لەگەڵ ئەوەشدا کە نەخۆش بوو چەندەها نەخۆش و چەندەها پەرستیار تەوبەیان کرد لەسەر دەستیا و بەرگی ئیسلامیان پۆشی.
کاتێك لە خەستەخانە بوو گۆرانیبێژی مەغریبی (عبدالهادي بلخياط) سەردانی کرد کە لەسەر دەستی سەعیدی کوڕی دا تەوبەی کرد بوو، گەڕابۆوە سەر گۆرانی لەگەڵ ئەوەدا کە نوێژەکانیشی دەکرد، دایکی سەعید پێی وت: ئەمشەو لە خەومدا پێم وتی: (🕮❒◙♑⧫☠⬀ ③⧫🕯▫♌⬀ ♑♎✂⮝🔔♎⇦✖♦ ⬈◆✂✍♦☪⬉❑☑✂☎ 🕮❒♌ ✍❒③⬂⌖♦➚⬓ 🔔➔🖬➔❑▯⬊&⬃☠⬀ ✐♐🔔♎🗎⇩❷⌧ ✂♐✐★ ❒◆✍♦♐ ☼♦❽♦✌♦ ✍♎♊⌘ ✂♐💻⬂♦❑🖃♎⬀ . . . ) الحديد:١٦.
چۆن دەگەڕێیتەوە سەر گۆرانی لە کاتێکدا لەززەتی ئیمان و موناجاتی خوات چەشتووە. خۆی گریا و عبدالهادیش گریا.
ئنجا بە سەعیدی وت: کوڕم من واهەست دەکەم ئەجەلم نزیك بۆتەوە، بمبە بۆ مەککە تا لەوێ بمرم ، سەعید وتی: دایە گیان مەککە هەر مردنی لێ نیە، بەڵکو زەمزەم و شیفا و وەڵام دانەوەی دوعایشی لێ یە.
دایکی وتی: ڕاست دەکەی وەڵام دانەوەی دوعای لێ یە، منیش دوعام کردووە لەوێ بمرم و لەوێش بنێژرێم ، بمبە بۆ مەککە. لە مانگی ذي القعدة دایکی برد بۆ مەککە و مانەوە تا کاتی حەج، وتی: دەمەوێت حەج بکەم، سەعید وتی:

دایکە تۆ ناساغی و ڕەنگە نەتوانی لەبەر قەرەباڵغی حەج بکەی و، خوا بە نیەتەکەت پاداشتت ئەداتەوە و ئنجا خۆ چەند حەجێکیشت کردووە.
دایکی حەزی کرد بە حەج کردن کۆتایی بە ژیانی بهێنێ و خوایش لەسەری ئاسان کردو تەنها تەوافی ئیفاضە ی مابوو بە کوڕەکەی وت: تەوافی ویداعم لەسەر نیە چونکە لە مەککە ناچمە دەرەوەو خوا حەزکات لێرە دەمرم.
باری تەندروستی تەواو نەبوو لەهۆش خۆی چوو نەیتوانی تەوافی ئیفاضە کەی بکات تا مانگێك دوای حەج، سێ ڕۆژ پێش ئەوەی وەفات بکات، تۆزێ حاڵی باشتر بوو کچەکەی شتی و عەبایەکی تازەی لەبەرکرد، کوڕەکەی پێ ی وت: دایکە فرسەتە تەوافی ئیفاضە کەت بکە با حەجەکەت تەواو بێ، لەسەر عەرەبانە تەوافەکەی تەواوکرد و دوو ڕکات نوێژی کرد لەپشت مەقامی ئیبراهیم و لەهۆش خۆی چووەوە، ویستیان بیبەنەوە بۆ ئوتێل لەنێوان بەردەڕەشەکە و ڕوکنی یەمانیدا هاتەوە هۆش خۆی و وتی: ڕامگرن، ڕووی کردە کەعبە و دەستی بەرزکردەوە و کەوتە دوعاکردن و وتی: الحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات، داوام لەخوا کرد لە مەککە بمرم، دوعاکەی قبوڵ کردم، ئای مردنێکی چەند خۆشە!
بۆ شەوی سێهەم کەوتە گیانەڵا و سەعید یاسینی لەسەر خوێند و خۆشی بە هێواشی لەژێر لێوەوە دەیوت: (لا إله الا الله اللهم هون علي سكرات الموت. . . اللهم هون علي سكرات الموت) .
دوو کوڕەکەی و کچەکەی بەدیاریەوە بوون، بانگی بەیانی دا و دایکیان بە دەم وتنی (لا إله الا الله) وە ئەندامەکانی لەشی یەك یەك سارد ئەبونەوە، بیریان کەوتەوە کە داکیان دوعای کردبوو کە (خوایە لە مەککە گیانم بکێشە لە

کاتێکدا کوڕەکانم لە حەرەمدا لە سوجدەدا بن) ! خێرا چوون بۆ نوێژی بەیانی لە کەعبە و خوشکەکەیان بەدیار دایکیانەوە بەجێ هێشت.

سەعیدو براکەی چوونە حەرەم بۆ نوێژی بەیانی، ئیمامی حەرەم (سعود الشريم) ئەم ئایەتەی خوێند: ([illegible]) . سەعید بە بیستنی ئەو ئایەتانە زۆر گریا. دوای ئەوە ئیمام لە سوجدەی دووەم هەستایەوە، دایکی سەعید لە ژوورەکەی خۆی لە ئوتێل بە دەنگی بەرز وتی: (لا إله الا الله) و گیانی دەرچوو. کاتی خۆی لە پێش هەموو وتارێکی هەینی دا سەعید تەلەفۆنی بۆ دایکی دەکرد دوعای خێری بۆ بکات، کە خوا یارمەتی بدات و قسەکانی کاریگەری هەبێت. . .

مزگەوتی (المغفرة) لە شارقە دەکرایەوە، ئەمیش یەکەم جار بوو بۆ نوێژی هەینی بچێتە سەر مینبەر بۆ وتاردان دوای مردنی دایکی، لە نیسانی ٢٠٠٢ دا، پێش ئەوەی بچێتە سەر مینبەر بیری لەوە کردەوە یەکەم وتارێتی دوای مردنی دایکی، لە دڵی خۆیدا وتی: ئەوەی کە دوعای بۆ دەکردم مرد، فرمێسك بە چاوانیا هاتە خوارێ، ئنجا قسەکەی ئەبوبەکری بیرکەوتەوە کە ئەگەر (محمد) یشﷺ وەفات بکات خوای محمدﷺ (حي قيوم) ە و ماوە، پاشان دوعای کردو وتی: (اللهم إني أتوسل إليك ببري لوالدتى أن تفتح علي ما يُرضيك عني) . .

چووە سەر مینبەر و بە گریانەوە وتارەکەی داو ئامادەبوانی مزگەوتیشی هێنایە گریان، بە تایبەت حاکمی شارقە (دكتور سلطان القاسمي) کە لەوێ بوو.

## مـردنی شێـخ سـەعید زەیـانی

شێخ سەعید لە شاری (رباط) ی وڵاتی مەغریب لە دایك بووە، پاش تەوبەکردنی و شارەزابوونی تەواوی لە ئیسلامدا لە ساڵی **١٩٩٣** دا لە قەتەر جنسیەی وەرگرت و خەریکی وتاردان و پێش نوێژی بوو ، بیست و پێنج ساڵ بانگەوای کرد بەشێوازێکی مۆدێرن و ئاسان و لە زۆر لە کەناڵە ئاسمانیەکانەوە بەرنامەی چاکی پێشکەش کرد.

شێخ سەعید زەیانی باسی خۆی دەکات و دەڵێت: منیش وەکو خەڵکی عەودالی بەختەوەری بووم و وامدەزانی کە بەختەوەری وا لە ماڵ و سامان و پلەو پایەدا، لەمناڵیەوە بەشداریم کرد لە بەرنامەی مناڵاندا لە تەلەفیزیۆندا و کە گەورەش بووم ئەکتەرو گۆرانیبێژێکی بەناوبانگم لێدەرچوو، زۆر لە کاربەدەستان بوونە هاوەڵم وەك سەرۆك وەزیرانی مەغریب کە زوو زوو سەردانم دەکردو، زۆر لە هونەرمەندانیش بوونە هاوەڵم وەك (عبدالحليم حافظ) ، بەخۆمم دەوت: باشە ئەگەر بشگەمە (عبدالحليم) خۆ ئەوەتا خۆی دەڵێ بەختەوەر نیە، پاشان مردنی ناوبراو زۆر کاری تێکردم و، هەردەم بیرم لای گەیشتن بوو بە ئاسوودەیی و بەختەوەری.

جارێکیان لە ساڵی ١٩٧٤دا ڕۆژنامەنووسێك پرسیاری لێکردم و وتی: تۆ ناوت (سعيد) ە ئایا گەیشتوویتە سەعادەت و بەختەوەری؟؟ منیش وتم: ناوەکەم لە چوار پیت پێکهاتووەو سێ پیتی (سعی) یەو هەوڵە بەدوای دۆزینەوەی پیتی

(د) دا تا بەتەواوی بگەمە بەختەوەری، پەیمان بێت کە گەیشتم هەواڵت بدەمێ.

بەڵێ پارە وسامانم زۆر بوو، ناو وشۆرەتم زیاد بوو، سەردانی ڕۆژئاوام کرد، کەچی هەر بەختەوەر نەبووم. شەیتانیش وەسوەسەی پێدەکردم و هانی دەدام کە مادام ناگەمە بەختەوەری و ناشادم خۆم بکوژم.

لەو ماوەیەدا پەڕاوێکی نووسەرێکی فەڕەنسیم دەستکەوت کە باسی خۆکوشتنی دەکرد و ئاماری زۆری تیابوو، لام سەیربوو کە ڕێژەی خۆکوشتن لە سوید زۆر زۆر بوو، لە کاتێکدا زۆر ژیان ئارام و خۆشە لەو وڵاتەدا،تەنانەت پردێکیان هەیە پێی دەوترێت پردی خۆکوشتن، ئەوەندە خەڵکی لە ژیان بێزار خۆیانی لێ فڕێ دەدەنە خوارەوە. . هەر لەو ماوەیەدا پەڕاوێکی ترم خوێندەوە لە بارەی ئەو کەسە ناودارانەی لە ڕۆژئاوا موسڵمانبوون، وەك گۆرانی بێژی بەریتانی کات ستیڤنس، کەناوی خۆی کرد بە یوسف ئیسلام، ئەوانە بە بەرنامەی خوا گەیشتنە لوتکەی بەختەوەری. .

براکەشم بە هۆی کۆمەڵێ برادەری بانگخوازەوە لە هۆڵەندا بوو بە پیاوێکی خواناس و بەتەواوی ژیانی گۆڕدرا، زۆر هەوڵیشیان لەگەڵ من دا، بۆیە منیش بڕیارم دا تەوبە بکەم و پەیڕەوی بەرنامەی خوا بکەم، بەمەش گەیشتمە ئەو بەختەوەری و ئاسوودەییەی کە بە دوایا وێڵ بووم، کە ئەوەش ئاواتی دایکم بوو، کە هەمیشە دەست بە دوعابوو خوا هیدایەتم بدات. . ئنجا نامەم نووسی بۆ ئەو ڕۆژنامەنووسەی کە کاتی خۆی پرسیارەکەی لێکردم، وتم: وا پاش دوانزە ساڵ لە پرسیارەکەت لە سایەی خواوە پیتی چوارەمی ناوەکەمم دۆزیەوە و لە سایەی بەرنامەکەی خواوە بەختەوەربووم.

شێخ سەعید ئەچێ بۆ سعودیە بۆ بەڕێکردنی جەنازەی (ابن باز) کە دەگەڕێتەوە بۆ قەتەر لە ڕێی مەککە بۆ طائف ژنەکەی زوو زوو تەلەفۆنی بۆ دەکات و دەڵێ پەلە مەکە و ئاگات لەخۆت بێت، پاش ماوەیەك ڕۆیشتن تایەیەکی سەیارەکەی ئەتەقێ و بەهەر حاڵێك دەبێت خۆی دەگرێتەوە و سەلامەت دەبێت ئنجا پەیوەندی بە ژنەکەیەوە دەکات و هەواڵەکەی ئەدەتێ، ئەویش دەڵێ: منیش لەوە دەترسام، ئەمشەو خەوم پێوە دیوی سەیارەکەت وەرگەڕا و خوێن لە سەرت هات ، سوپاس بۆ خوا کە بەوە کۆتایی هات.

پاش گۆڕینی تایەکە دەکەوێتەوە ڕۆیشتن و لە دڵی خۆیدا دەڵێت: عەمرەم کردووە و ئامادەی ناشتنی زانای گەورە (ابن باز) بووم و ئەم هات و چوونەشم تەنها لەبەر خوا بووە، ئەگەر بەم حاڵەوە بگەڕێمەوە بۆلای خوا، خوا بە ڕەحمە.

ئنجا دەڵێ: ئەوەندەم زانی گوێم لە دەنگێکی گەورە بوو سەیارەکەشم وەرگەڕا و تەقلەیەکی لێدا منیش بە دەنگی بەرز (لا إله الا الله) م وت سەیارەکەم تەواو تێك شکا هەرچی بیبینیایە دەیوت کەسی تیا دەرنەچووە، سەیارەی تر کە لەدوامەوە بوون و ئەوانیش لەو مەراسیمە گەڕابوونەوە لە ئەهلی (ریاض) ، لە سەیارەکە دەریان هێنام و گوێم لێبوو دەیان وت ڕوبکەنە قیبلە، شایەتمانی پێ بڵێن، منیش بە دەنگێکی نزم دەم وت: کێ دوا قسەی (لا إله الا الله) بێت دەچێتە بەهەشتەوە، بە شایەت بن وا من دوا قسەم (لا إله الا الله) یە.

دوایی بردمیانە خەستەخانەیەکی (طائف) و پاش چوار ڕۆژ هێنامیانە خەستەخانەی نور لە مەککە، دوو پزیشك چارەسەری شکاوییەکانیان بۆ دەکردم یەکێکیان سووری و ئەوی تریان میسری بوو، منیش قسەی خێری زۆرم بۆ کردن، پێش ئەوەی دەرچم لە خەستەخانە هاتنەلام و وتیان ئێمە لە خوا

دووربوین و عیلمانی بووین له سایەی خواوە تۆبەمان کرد و ئێستا هەردووکمان نوێژ دەکەین.

سبحان الله ئەوجارە خوا دایەوە و نەمرد، خوای گەورە هێشتیەوە بۆ کۆتایی ساڵی ۲۰۰۹ کە ئەمجارەشیان بە رووداوی ی سەیارە و وەرگەڕان لەکاتی گەڕانەوەیدا لە وڵاتی سعودیە لەلای شاری (أبو ظبـي) کۆچی دوایی کرد. (کل نفس ذائقة الموت) ل ۱۲ نوێبوونەوە_موجەڵەدی یەکەم / زنجیرەی هەزارویەك) ... وێنەی شیخ سعید الزیانی



**دایکی وەلید:**

**دایکی وەلید (هیلە کچی أبو حمید) ئافرەتێکی بانگخوازی سعودیەو لە شاری (ریاض)خزمەتێکیگەورەیبە پەیامیخوا کرد بۆماوەی زیاتر لە سی ساڵ.**

لە کاتی شەڕی (بۆسنە و هرسك)دا مێردەکەی منالێکی ئەو وڵاتەی کەفالەت کرد و ئەمیش منالێکی تری کەفالەت کرد، پاشان هانی مامۆستاکانی هاوەڵی دا لە قوتابخانە کە ئەوانیش ئەو کارە خێرە بکەن، بە هۆی ئەوەوە توانیان پانزە منالی بێ باوکی بۆسنەیی کەفالەت بکەن و مانگانە پارەیان بۆ بنێرن. دایکی وەلید لە ڕێی پیرێژنێکی خزمیانەوە بە ناوی دایکی عبدالرحمان هانی دەر و دراوسێی ئەدا کە زەکات و پارە و ماڵ کۆ بکەنەوەو یارمەتی هەژار و لێقەوماوانی پێبدەن، ئەمەش سەرەنجام دەزگایەکی خێرخوازی لێ دروست بوو بە ناوی ( دەزگای نوور) کە ئێستاش لە ڕۆژئاوای ریاض کار دەکات.

دایکی وەلید پاش ئەوەی ئەو منالەی کەفالەت کرد کەوتە خۆتەواو کردن و خۆ پێگەیاندن لە ڕێی کاسێت و پەڕاوەوەو بەردەوام شەو نوێژی دەکرد و بە ڕۆژیش زۆر جار بە ڕۆژوو دەبوو تەنانەت لەم دواییەدا ڕۆژ نا ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو هەروەك ڕۆژوەکەی داوود سەلامی خوای لێبێت.

دایکی وەلید لە ماڵی خۆیاندا هەموو عەسرێکی هەینی وانەی بە خەڵکی و دەرو دراوسێکانی دەووت، جاری وا هەبوو ژمارەیان دەگەیشتە سەدو پەنجا ئافرەت. ئەمە بێجگە لەوەی کە کێشەکانیانی بۆ چارەسەر دەکردن و جێی ڕاز و نیازی هەمووان بوو. لە لایەکی تریشەوە مێردەکەی ( حمد الناجم) دەرسی بە کوڕانی گەڕەك دەووت و هانی ئەدان لەسەر نوێژی بەیانی لە مزگەوتدا و پێشبڕکێی بۆ دائەنان بۆ لەبەرکردنی قورئان و پەڕاوخوێندنەوەو گوێگرتن لە کاسێت و جائیزەی ئەدانێ.

دایکی وەلید هەمیشە دوعای دەکرد کە عاقیبەت خێر بێت و لەکاتی وانەوتنەوەو بانگەواز کردندا یان لەحەرەمی مەککەدا گیان بسپێرێت، کوڕێکی لە پۆستێکدا دائەمەزرێت و دەچن بە دەم مامەڵەی دامەزراندنەکەوە لە مەککە، پێش نوێژی بەیانی لە حەرەم دەکەونە مەراسیمی عومرە کردن لە مانگی شەعبانی ئەم ساڵدا (٢٠٠٨)،لەگەڵ کوڕەکەی و کچەکەیدا و ، داوایان لێ دەکات کە نیەتی ڕۆژووش بهێنن لەبەرئەوەی ئەو ڕۆژە پێنج شەمە بوو. لە کاتی تەواف دا دوعای زۆری کرد بۆ ئەوانەی کە دەیناسین و دوعای بۆ خۆشی دەکرد کە عاقیبەت خێر بێت و خوای گەورە گیانکێشانی لەسەر سووك بکات، ئینجا ئاوڕی دایەوەو باسی مردنی لە پڕی بۆ کچەکەی کرد و وتی دەبێت بڕوادار ئارامگر بێت، ئینجا چوو لە ئاوی زەمزەمی خواردەوە و سەریشی پێ تەڕ کرد... پاشان چوون بۆ صفا و مەروە و پاش پێنج جار هاتن و چوون لە نێوان کوڕەکەی و کچەکەیدا گیانی سپارد و کەوت، دەستیان دایە باڵی هەڵی گرنەوە سەیریان کرد قورس بووەو گیانی سپاردۆتەوە بەو خوایەی کە چەندەها ساڵ بوو بانگەوازی بۆ دەکردو هەوڵی ئەدا لە پێناویدا...

پێنج ڕۆژ پێش ئەوەی بمرێت وتارێکی دا لەبارەی مردن و ئادابی سەرخۆشی کردن،کچەکەی دەڵێت: دایکم بەرماڵێکی داخستبوو لە سووچێکی ماڵەکەدا و هەمیشە لەوێدا نوێژی دەکرد و هەمیشە ڕاخرا بوو ئەگەر سەفەریشی بکردایە،کەچی کاتێك ویستمان بچین بۆ عەمرە بەرماڵەکەی پێچایەوە،من پێم ناخۆش بوو حەزم نەکرد بەرماڵەکەی

هەڵگریێتەوە ئەو هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی کەلای بات ، هەروەك دڵی خەبەری دابێت کە دوا سەفەرەو جارێکی تر لەسەر ئەو بەرماڵە ناوەستێ لە بارەگای خوادا بۆ خواپەرستی..

ناوبراو خەوێکی دیبوو کە کۆچی یەکجاری نزیکەو لە حەرەمدا دەبێت وبەمناڵەکانی وت خەوێکم بینیوە ئەگەر ڕاست بێت چەند ڕۆژێکی تر دەیبینن دێتە دی ، بۆیە سووربوو لەسەر ئەوەی بچێ بۆ حەرەم و لە فڕۆکەخانە زۆر دوعای بۆ مێردەکەی کردکە بواری بۆ ڕەخساندبوو بۆ بانگەوازکردن.

پاش ئەوەی لە مەککە بەخاکیان سپارد و هاتنەوە بۆ ریاض مامۆستای مزگەوتەکەیان هات بۆ سەرخۆشی کردن و وتی :بەڕاستی دوای ئەو ئیتر مزگەوتەکەمان بێناز دەبێت بەهۆی ئەو یارمەتیانەی کە ڕەحمەتی دەینارد بۆ دەرس و دەوری مزگەوت و قوتابیانی مزگەوت ،مناڵەکانی بەمەیان نەزانیبوو ، دیاربوو ئەمە یەکێ بوو لەو کارانەی کە بۆ خوا دەیکردو حەزی نەدەکرد کەس بیزانێت ، هەروەك زوبەیری کوڕی عەوام دەڵێت :( من استطاع منكم أن يكون له خبيئة من عمل صالح فليفعل ) گۆڤاری الأسرة، ژمارە ١٨٦/رەمەزان ١٤٢٩ك(بەرەو ئیسلام ).

**کۆچی دوایی مەودوودی:**

حومەیرای کچی مەودوودی دەڵێت :کاتێ نەخۆشیەکەی باوکم زیادی کرد ڕۆژێك پێی وتین (من زۆر زوڵمم لە خۆم کردووە، هەرگیز ڕەحمم بە لاشەم نەکردووە، هەقی چاوم نەداوە لە خەو، چاوەکانم خەویان دەویست

من زۆرم لێدەکردن بۆ شەونخونی و نووسین، زۆرجار دوای نوێژی عیشا دەکەوتمە نووسین کاتێك بە خۆم دەزانی بانگی بەیانی ئەدا، ئەگەر ئەمەشم نەکردایە نەم ئەتوانی تەفسیری (تفهیم القرآن) تەواو بکەم ،جا وائێستا چاوەکانم هەقم لێ دەکەنەوە،ئەمەوێ پشوو بدەم و چاو لێك بنێم، کەچی خەو بە چاوما نایەت، ڕامهێناون لەسەر شەونخونی و ئێستا مانای نووستن و پشودانیان لەبیر چۆتەوە. ئەمەوێ بیرم مەشغوڵ نەبێ و پشوو بدەم بەڵام چونکە خۆم وا فێر نەکردووە ناتوانم فکرم ساف بکەم و بیر نەکەمەوە، خۆم زۆر ماندوو کرد، بۆیە ئێسقانەکانم هەقم لێ دەکەنەوەو ئەمڕۆ نایەڵن تۆزێ ئیسراحەت بکەم.

باوکم داوودەرمانی کەمکردنەوەی ئازاری دەخوارد ئەوەش ئەوەندەی تر تەندروستیان ڕوخاند، دایکم تکای لێکرد کە لەگەڵ (ئەحمەد فاروق)ی برامدا بچێ بۆ ئەمریکا، سەرەنجام باوکم قایل بوو، براکەم کە لە ئەمریکا بوو گەڕایەوەو لە (٢٦ی مایو ١٩٧٩) لەگەڵ باوکمدا چوون بۆ ئەمریکا بۆ عیلاج.

پاش سەردانی چەند دکتۆرێك مانگی یەکەم باوکم باشتر بوو، کەوتە نووسینی پەڕاوێك لەسەر ژیانی خۆشەویست ﷺ،لە هەموو لایەکیشەوە خەڵکی دەستە دەستە دەهاتن بۆ لای و زۆربەیان لەوانە بوون کە بە هۆی نووسینەکانی باوکمەوە ڕێی ڕاستیان دۆزیبووەوە، یان باشتر پابەند بوو بوون بە ئیسلامەوە، پێیان دەوت: ( ئێمە هەر بە ناو موسڵمان بووین، بە

ڕاستی خوا بەهۆی پەڕاوەکانی تۆوە هیدایەتی داین و زیاتر پابەند بووین بە ئیسلامەوە ،خوا پاداشتی خێرت بداتەوە لـەسەر ئێمەو موسڵمانان).

تەنانەت یەکێ لـەوانەی سەردانی باوکمیان کرد (ئەلیکس هیلی) بوو خاوەنی پەڕاوی بەناوبانگی (الجذور)، کە نوسخەیەکی کتێبەکەشی پێشکەش بە باوکم کرد.

لـە (٨ی سێبتەمبەری ١٩٧٩)دا باوکم جەڵتەیەك لـێیداو دوای دوو هەفتەش گورچیلـەکانی و جگەری وەستان و ئەو ساتە وەختە هاتە پێشەوە کە ڕاکردن نیە لـێی، لـە (٢٢ی سێبتەمبەری ١٩٧٩) باوکم لـە خەستەخانەی (بفیلو) لـە ئەمریکا گیانی سپاردەوە بەوخوایەی کە هەمووئەچینەوە بارەگای ئەو.

دایکێکی خۆگر:

کاتێك براکەم لـە خەستەخانە گەڕایەوە، هەروەك پەڕۆ کۆنی لـێهاتبوو لـە خەم و خەفەتدا، کە هەواڵی وەفاتی داینێ، دایکم دڵنەوایی کردو وتی ( کوڕم ئارام بگرە، سوپاسی خوا بکە، کە لـە سایە و سێبەری باوکتدا گەورە بوویت، خەریك بوو لـە ١٩٥٣دا لـە سێدارەی بدەن، ئەگەر ئەو کاتە بڕۆشتایە ئەوا هەر شێوەشت نەدەکردو وێنەکەشی نەدەهاتەوە یادت)...

دایکم دڵنەوایی هەمووانی دەکردو دەیووت (بڵێن: إنا لله و إنا إليه راجعون)...

خەڵکی ئارامگریی دایکمیان زۆر بەلاوە سەیر بوو...

خاڵم (دکتۆر جەلال شەمسی) بە سەیارەکەی لە (تۆرنتۆ)ی کەنەداوە هات بۆ لای دایکم، خەریك بوو لە داخا لە هۆش خۆی بچێ، کە دایکمی بەو شێوەیە بینی لای سەیر بوو وتی: خوشکم من بە درێژایی ڕێگا ئەگریم و لە بیری ئەوەدا بووم چۆن بتوانم دڵنەوایت بکەم..

ئەویش وتی: برام ئیمان بە خواو پشت بەستن پێی و ئارامگرتن سیفاتی بەرزن کە مرۆڤ بە هۆیانەوە دەتوانێ ڕووبەڕووی گەورەترین تەنگوچەڵەمەو ناخۆشی ببێتەوە.

کاتێك لە فڕۆکەخانەی نیویۆرك چاوەڕێمان دەکرد و جەنازەکەی باوکم گەیشتە فڕۆکەخانە ، ژنانی پاکستانی و هیندی و ئەفریقی زۆر هاتن بۆ فڕۆکەخانەو، چەند کەسێکیان پرسیاریان دەکرد ئاخۆ جەنازەکە گەیشتبێ، دایکم وتی: بەڵێ گەیشتووە! وتیان: چوزانیت؟! وتی: من هاوسەری ئەوم، خوا ڕەحمی پێبکات! ئیتر هەموو کەوتنە سەرخۆشی لە دایکم و گوێم لێ بوو بە یەکتریان دەوت: (بە ڕاستی ئەوەیە ئارامگرتن).

**لە سێ کیشوەر نوێژیان لەسەر کرد:**

ئەو موسڵمانانەی هاتبوون بۆ فڕۆکەخانەی نیویۆرك ئەوەندە زۆر بوون بە شەش جار نوێژی مردوویان لەسەر باوکم کرد، لە فڕۆکەخانەی لەندەنیش کە دەکەوێتە کیشوەری ئەورووپاوە موسڵمانانی ئەوێ نوێژیان کرد لەسەر باوکم، لە (لاهور)یش لە کیشوەری ئاسیا ژمارەیەکی زۆری موسڵمانان نوێژیان کرد لەسەر باوکم...

ڕاسته باوکم سەری نایەوە، بەڵام کاتێ سەری نایەوەو کۆچی کرد کە لەسەر تاسەری دنیادا نووسینەکانی وریا بوونەوەیەکی ئیسلامیان بەرپا کرد کە تا قیامەت پاداشتی بۆ دەنووسرێت...

.

**بەسەر جلە کۆنێکدا مەگرین:**

که گەیشتینەوە لاهور دایکم ئامۆژگاری کردین و وتی (بەسەر ئەم جەستەیەدا مەگرین، ئەو جەستەیە جلە کۆنێکە، چونکە جەستە وەك بەرگێك وایە بۆ ڕۆح ، هەروەکو هەموو جل و بەرگێکیش کۆن دەبێ و ڕەنگی تێك دەچێ و پینە و پەڕۆ دەکرێت و بە کەڵکی بەکارهێنان نامێنێ، ئەو کاتە ڕۆح ئەو بەرگە لە خۆی دا ئەکەنێ و فڕێی ئەدات و بەرگێکی نوورین لەلایەن خواوە دەپۆشێ ... بە ڕاستی ئێستا باوکتان زۆر ئیسراحەتی کردووە، گەڕاوەتەوە بۆ لای ئەو کەسەی کە ڕێزی لێ دەگرێ و قەدری ئەزانێ ، ئەوەی کە لە ئەمریکا لە تابوتدا بۆتان هاتۆتەوە بەرگ و پۆشاکێکی کۆنە، هەیە بگری بەسەر جل و بەرگ و پۆشاکی کۆن دا؟!

بە ڕاستی دایکم بەو شێوازە ئاسانە پڕ مانایە توانی سەبووریمان بدات و هەمیشە سەرمەشق بێت بۆمان .

**مردنی دایکم :**

دایکم لە دوارۆژەکانی ژیانیدا زۆر ناوی باوکمی دەبرد وتەنانەت جارێك لە گەرمای زۆرو بێ کارەباییدا کە تەنگەنەفەسی لەگەڵدا بوو لە هۆش خۆی چوو ،کەهاتەوە هۆش خۆی بە دڵخۆشیەوە وتی : باوکتان بانگم دەکات ودەڵێ سەرکەوە وەرە بۆ ئێرە ، سەیرکە کەش و هەوا چەند

خۆشە ، چی دەکەیت لەو گەرمایەدا ..ئنجا دایکم هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی : تو خوا پێم بڵێ چۆن بێم بۆ لات ؟؟ من چاوەڕێی بانگهێشتی خوام وهێشتا بانگی نەکردووم .

لە ئێوارەی هەینی مانگی ئیبریلی ٢٠٠٨ دوای بیست و چوارساڵ لەکۆچی باوکم دایکیشم کۆچی کرد ..پێم خۆشە یادەوەرییەکانم بەم دێڕە هۆنراوەیە بهێنم کە دایکم زۆر حەزی پێدەکرد کە دەڵێت :

ننام قریری العین الی یوم الحشر فقد ارتحنا من حمل الامانة وهموم الدنیا

خوای گەورە بەخۆشەویستی فەرموو ( یاأیها المزمل قم )(یاأیها المدثر قم) ئەوەبوو ٢٣ ساڵ دانەنیشت ، مەودوودیش کەشوێنکەوتەی ڕەسولی نازدارە ئەیانووت دانیشەو پشوو بدە ، دەیووت : ئەگەر من دانیشم ئەی کێ بەپێوەبێت ؟..ئەوەتا پاش دەیان ساڵ خەباتی بێوچان دونیای فانی بەجێدەهێڵێ و خۆی و هاوسەرەکەی دەڵێن: ئیتر بەئاسوودەیی چاومان لێك دەنێین تا ڕۆژی قیامەت، رزگارمان بوو لەدەست ئەمانەت و خەمی دونیا ..(ئای هەزار جار خۆزگەمان بەخۆتان ، خوایە ئێمەش والێبکە وەك ئەوان بۆ دینەکەت بژین و بەڕاستی ئەمانەتی ئیمان و ئیسلام هەڵگرین ).

(المجتمع ١٨٣١)(بەرەو ئیسلام _نووسەر لا٤٧٠).

## حوسنی خاتیمە

محمد غەزالی لە ساڵی ١٩١٧ لەمیسر لەدایك بووەو پەنجا ساڵ خزمەتی بە بانگەوازکردو ژمارەیەکی زۆر پەڕاوی نووسی و پێی دەوترا ئەدیبی دەعوە،ئەم پیاوە باشە پەنجا ساڵ بانگەوازی کردو حەزی دەکرد لە بەقیع بنێژرێت،سبحان الله لە کاتی بەشداری کردنی لە کۆنفرانسی(الاسلام

وتحديات العصر)دا كۆچی دوایی کرد لە سعودیە لەساڵی ١٩٩٦ داو لە بەقیع نێژرا.
شێخ محمد محمود الصواف دامەزرێنەری کۆمەڵی برایان لەعێراق لە فڕۆکەخانەی ئەستانبوڵ لەکاتێکدا کەباسی ئیسلامی بۆ ئافرەتێك دەکرد وەفاتی کرد.
بانگخوازی ئەمریکی ئەمینە ئەسیلەمی کە بەهەزاران کەسی موسڵمان کردووە لەکاتی گەڕانەوەدا لەوتاردان لە شارێکی ئەمریکی لەگەڵ منداڵێکیدا ئوتومبیلەکەی وەرگەڕاو کۆچی دوایی کرد.
شێخ عبدالحمید کشك لە سوجدەدا گیانی سپارد.
شێخ ئەحمەد دیدات هەتا کۆچی دوایی کرد بە ئیشارەتی چاوی کە کوڕەکەی تەختە رەشێکی دانابوو پەنجەی دەخستە سەرپیتەکان و بەوەش وشەو رستەی دروست دەکرد بانگەوازی کرد،ئیفلیجی تەواو نەبووە بەربەست لەرێی ئەو بانگخوازە مەزنەدا.

**دکتۆرخالیدجوبەیر:**

جەڕاحێکی دڵی بەناوبانگی سعودیە دەڵێت :رۆژێك گەنجێکی ١٦ ساڵی خواناس لەمزگەوت جەڵتە لێی داو بەپەلە هێنایان بۆ بەشی فریاکەوتنی خێرای خەستەخانە،زۆر هەوڵمان لەگەڵدا، دکتۆری موقیمی بە دیارەوە بوو منیش شپرزەبووم و خەریکی ئەوەبووم بە هەندێ ئامێری تر فریای بکەوین،چوومە دەرەوەو خێراهاتمەوە بینیم دەستی موقیمەکەی گرتووەو

شتێکی پێووت و رووی کرد بەلای راستداو بەهەزارحاڵ شایەتمانی دووبارە دەکردەوەو لەپڕ دەستی دکتۆرەکەی بەرداو دواهەناسەی داو وەفاتی کرد،دکتۆرەکە زۆر بەکوڵ گریاو ئەژنۆی شل بوو ناچار دانیشت،لامان سەیربوو ! وتمان : خۆ ئەمە یەکەم جارت نیە لەم حاڵەتانە ببینی بۆ وادەکەی؟ بەدەم گریانەوە وتی : دکتۆر خالید کەتۆی دی ئاوا شپرزیت و ئەتەوێ هەرچۆنێك بێ فریای بکەویت،پێی وتم : بەدکتۆر بڵێ : باخۆی ئەزیەت نەدات من ئەمرم،وا جێگاکەی خۆم ئەبینم لە بەهەشتا !

## سەرگوزەشتەی مەلا رامی

لە هەشتاکاندا سەباح میرزا(کە پاسەوانی سەدام بوو ) لەگەڵ عیزەت دوری ئەچن بۆ تەعزیەیەك لە دوزخورماتوو، هەموو خەڵکەکە لەبەریان هەڵدەستن تەنها مەلا رامی نەبێت کە قورئانی دەخوێند ، دوایی سەباح میرزا پرسی ئەوە کێیە وا هەڵنەستا وتیان ئەوە ناوی مەلا رامیەو کوردە ، وتی : زۆر باشە دیارییەکی باشی بۆ ئەنێرم.

مەلا رامی جبەیەکی بەدیاری لەبرادەرێکەوە بۆ هاتبوو،بەهاوسەرەکەی دەڵێ: بۆم بهێنە بالەبەری بکەم هەر ئەوە دەمێنێ ، بۆ شەوی دوایی هێزی تایبەت دێن و دەیبەن و کەس و کارەکەی تاماوەیەکیش وەیانزانی بردوویانە دیاری پێبدەن،سەرەونگومیان کرد.

پاش ٢٥ ساڵ هەواڵیان زانی کەلەکەرکوك لەتۆپزوا لەگەڵ شەست کەسی ترا شەهید کراوەو ناشتویانن،کە خزمانی ئەچن گۆڕەکە

هەڵئەدەنەوە، سبحان الله ئەتووت خەوی لێکەوتووەو هەروەك خۆی بوو تەنها جبەکەی و رووخساری تۆزو خۆڵی لێنیشتبوو.
پشت بەخوا شەهیدەو مەزڵومەو خواش ئەوەی وەك کەرامەتێك بۆ کردووە ( ئەمە مامە قالەی خزمیان بۆی گێڕامەوە لە هەڵەبجەی تازە کەخۆی لەوێ بووە لەکاتی هێنانەوەی تەرمەکەیدا).

## سەید قوتب :

ناوبراو لەسەر نووسین و بانگەوازکردن چەند ساڵ لە بەندیخانەو ژووری تاکەکەسیدا سزا درا، بەوەشەوە مەزنترین تەفسیری نووسی ، دووساڵ ئازادکراو لەسەر کتێبی (معالم فی الطريق) گیرایەوە ، سەید تەمەنی شەست ساڵ بوو ئەوەندەیان تەعزیب دابوو تەنها یەك سی ئیشی دەکردو چەند نەخۆشی هەبوو ، عبدالسلام عارفی سەرۆکی عێراق لە ساڵی ١٩٦٦دا چووە لای ، کەزۆر سەرسام بوو بەنووسینەکانی و ڕجای دنیای لێکرد کە لەگەڵیا بچێتە عێراق و هەموو سەلاحیاتێکی ئەداتێ ، ئەویش رازی نەبوو ساحەکە بەجێ بهێڵێ و وتی : هەیە لەتەمەنی شەستساڵیدا شەهادەتی بۆ بێت و نەیەوێت ؟؟.

سەید لە بەندیخانەدا خەوی دیبوو گۆزەیەك هەنگوین شکابوو هەنگوینەکەی بە ناو ژووری سجنەکەو دەرەوەدا بلاوبوەوە، زۆر دڵی خۆش بوو بەو خەوەو بەوە لێکی دایەوە کە ئەوەی نووسیویەتی بەدونیادا بلاو دەبێتەوە ، کەهاتن بردیان لە سێدارەی بدەن ، وتیان ئەتبەین بۆ

شوێنێکی تر پشوو بدەی ، وتی : ئەزانم ئەچم بۆ بەهەشت پشوو ئەدەم ،وتیان: چۆن دەزانی ؟؟وتی : تۆزێ لەمەوپێش خۆشەویستم بینی(د.خ)لەخەوما لە ئەسپێکی سپی دابەزی و تەوقەی لەگەڵ کردم و دەستی گوشیم و فەرمووی :مژدەت لیبێت شەهید دەبیت .

پێش ئەوەی شەهیدی بکەن مەلایەکی دەسەڵاتیان هینا و پێی وت : بڵێ لاالە الا الله ، ئەویش وتی : تۆ دوا مەشهەدی شانۆگەریەکەیت ، داوام لێدەکەیت لاالە الا الله بڵێم ، من وا لە پێناوی لاالە الا اللە دا شەهید دەکرێم.دەڵێن :لەبەر پەتی سێدارەدا داوای کرد رێی بدەن دوورکات نوێژی سوننەتی شەهید بوون بکات،کە نوێژەکەی کرد لە سوجدەدا گیانی سپارد. خوایە رووی هەموو ئەوانە رەش بکە کە بە فەرمانی موخابەراتی سعودی زەمی سەید قوتب دەکەن و دەیانەوێت لەبەرچاوی خەڵکی ڕەشی بکەن .

## ماڵئاوایی نوورسی :

مامۆستا باسی خۆیمان بۆ دەکات و دەڵێت : وا دەزانن من پیاوێکم تەنها خەیاڵم رزگاکردنی نەفسی خۆمە ؟ نەخێر وانیە ، من دنیا و ئاخیرەتی خۆمم کردە قوربانی رزگارکردنی ئیمانی کۆمەڵگە ، بەدرێژایی تەمەنی هەشتا و ئەوەند ساڵیم لەزەت و خۆشی دنیام نەچەشت ، ژیانم هەمووی لەمەیدانی جەنگ و بەندیخانەکانی دیلی و بەندیخانەکانی ولآتەکەمدا بەسەر برد ، هیچ سزا و ئازار و موسیبەتێك نەما نەیچێژم ، وەك تاوانبار لە

( مەحکەمەی عەسکەری عورفی )دا دادگایی کرام ، وەك دەربەدەر و ئاوارەکان لەسەرتاسەری ولاتدا دوور خرامەوە ، بەچەندەها مانگ لە بەندیخانەدا نەیاندەهێشت چاوم بەکەس بکەوێ ، وە چەندەها جار دەرمانخواردیان کردم ، هەرچی ئیهانە و سووکایەتی پێکردن بوو کردیان بەرامبەرم ، کاتی وام بەسەردا هاتووە کە مردن هەزار قات چاکتر بوو بەلامەوە لە ژیان ، وە ئەگەر ئاینەکەم ڕێی خۆکوشتنی نەگرتایە رەنگ بوو زۆر لەپێش ئێستە دا سەعید گڵ بوایە و لەژێر گڵدا بوایە ...

ئابەوجۆرە ژیانم رابوارد ، بەناخۆشی و نارەحەتی و بەلاو موسیبەت ، بەوجۆرە خۆم و دنیاکەم کردە قوربانی ئیمانی کۆمەڵگە کەم و بەختەوەری و سەلامەتیەکەی ، من لەدوعا کانیشمدا دوعا لەکەس ناکەم . بەم شێوە و حاڵە ( پەیامەکانی نور ) بوونە هۆی رزگارکردنی ئیمانی سەدەها هەزار کەس بەلای کەمەوە ، بگرە ملیۆنەهاش ، من نازانم سەر ژمێریم نەکردووە ، وا دەڵێن ، داواکاری گشتی لەشاری ئەفیون دەڵێ( ٥٠٠ ) هەزار کەس زیاتر دەبن .

بەمردنم تەنها ئیمانی خۆم رزگار دەکەم ، بەلام بەمانەوەم لەم ژیانەدا و بەئارام گرتنم لەسەر بەلاو نارەحەتی و کێشمە کێش ، خزمەتم کرد بەرزگارکردنی ئیمانی ئەو هەموو خەڵکە ، هەزار جار سوپاس بۆ خوا .

ئەوەی ئیسراحەتی لەبەر هەڵگرتووم ئەو پیلانانەیە کە دەوری ئیسلامیان داوە ، جاران پیلانەکان لەدەرەوە دەهاتن ، بەرگرتنی ئاسان بوو ، بەلام

لەناوخۆوە پیلان دێت و کرم و مار و مێرو و داویەتیە لاشەی کۆمەڵگا و ڕوو بەڕوو بونەوە یان ئاسان نیە ، چونکە وەك دوژمن دەرناکەون ، کۆمەڵگا ئەو خوێن خۆرانە بەدۆست دەزانن ، جاکاتێکیش چاوی کۆمەڵگا و بەصیرەتی کوێربوو ئەوا قەڵای ئیمان دەکەوێتە مەترسیەوە ، خۆزگە سەد ئەوەندەی تریش تووشی ئازار و ئەشکەنجە ببومایە ، بەڵام قەڵای ئیمان بێ زیان بوایە... من وانەیەکی گیان فیدایم لە ئەبوبەکری سدیقەوە وەرگرتووە کە فەرموویەتی :(بالاشەی من ئەوەندە لەدۆزەخدا گەورە ببێ کەجێی هیچ بڕوادارێکی تیا نەمێنێتەوە )

پاش دەیان ساڵ ڕەنج و خەبات ، مامۆستا نوورسی لە ١٩٦٠/٣/٢٠ بەقوتابیەکانی وت : ئوتومبیلەکە ئامادەکەن دەچین بۆ شاری ( ئورفە ) قوتابیەکانیشی دەڵێن : مامۆستا گیان ئوتومبیلەکە تایەکانی باش نیە و ، باران و لێزمەیە و بەرێزیشت پلەی گەرمیت زۆر بەرزبۆتەوە و نەخۆشیت ، چۆن لەم کاتەدا بڕۆین ؟ ئەویش وتی : بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (د.خ) بانگکراوین ، پێموتراوە : زوو وەرە .

( لەفەرموودەدا هاتووە کە خۆشەویست(د.خ) فەرمویەتی : ژیانم خێرە بۆتان و مردنیشم خێرە بۆتان ، ئەگەر مردم کارەکانتانم پیشاندەدرێ ئەگەر چاك بوو سوپاسی خوای لەسەر دەکەم وە ئەگەر خراپیش بوو داوای لێ بووردنتان بۆ دەکەم ) .

ڕەنگە خۆشەویست(د.خ) بە فەرمانی خوا لـەخەودا مژدەی دابێ بە مامۆستا بەگەڕانەوە بۆ لای خۆی و دیارە پێی فەرمووە کە تۆ لـە شاری ئورفە دەمریت و زوو وەرەوە بۆلامان . پیاوانی خوا دیارە کەرامەتیان دەبێ ، هەرچەند نوورسی کەراماتی زۆرە ، لێرەدا تەنها ئەم ڕووداوە باس دەکەین .

مامۆستا مەلا حمید ئەفەندی زانایەکی ناوداری شاری ئورفەیە دەڵێ : لـە مانگی ڕەمەزاندا لـە مزگەوتی ( قازی ئوغلۆ ) ئیعتکافم کردبوو ، شەو لـەخەوما بەبێ ئەوەی ئاگاداری هیچ ببم ، خەوم بە مامۆستا نورسی یەوە بینی کە پێی وتم وەرە بۆلام بۆ ئەوەی ئامادەی جەنازە و کفن و دفن و شتنەکەم ببی ، چونکە من دەمرم ، منیش وتم : مامۆستا نابێت ئەوەی ئیعتکافی کردبێ لـە مزگەوت دەرچێ ، چی بکەم باشە ؟ ئەویش وتی : سەیری فلانە لاپەڕە بکە لـە پەڕاوی ( ملتقى الابحر ) دا ، دەبینی باس لـە شکاندنی ئیعتکاف دەکات بۆ زەروورەت ، منیش لـەخەو ڕاپەڕیم و خێرا سەیری ئەو پەڕاوەم کرد دەبینم لـەو لاپەڕەیەی کە ئەو فەرمووی ئەوباسەی تیایە و منیش ئیعتکافەکەم واز لێ هێنا و چووم ، ئامادەی کفن و دفن و شتنەکەی بووم ! شایانی باسە مامۆستا سەعات سێی شەوی ١٩٦٠/٣/٢٣ لـە شاری ئورفە گیانی سپارد.سەرچاوە(سيرة ذاتية )ی نورسی.

## شێخ عبدالحمید کشك

ناوبراو کوێر بوو ، وتاربێژێکی کەم وێنەی بوێر بوو ، ئیخوان و گشت موسڵمانانی خۆش دەویست هەرچەند ئیخوانیش نەبوو ، دژی ستەم و ستەمکاران بوو ، لەوتارە ئاگرینەکانیدا هێرشی دەکردە سەر دەسەڵات و سەرۆکەکان ، کاتێ لە ١٩٦٧ میسر شکا لەبەردەم ئیسرائیلدا ئەیووت : ئێمە خاوەنی (صلاح نصر ) ی مودیری موخابەرات بین خوا چۆن نصرمان ئەداتێ ،.یان دەیووت: ئێمە داوای ئیمامێکی عادیلمان لەخوا کرد کەچی خوا عادل ئیمامی داینێ !

(عبدالحکیم عامر ) داوای لێکرد و وتی : ئێمەدەزانین چەند جەماوەرت هەیە فەتوای کوشتنی سەید قوتبمان بۆ بدە .جانەك خۆی گوناهبار نەکردو فەتوای نەدا بەڵکو لە وتارەکانیدا دیفاعی لێکرد .

دووساڵ لەسەر ئەوە بەندکرا و ئازاریان دا ،کەدەیخەنە ژووری بەندیخانە دەڵێ :دەستم گیڕا ژوورێکی رەق و تەق و ساردو سڕو شێداربوو، عەمامەکەم خستە ژێر سەرم و بێکەس و بێدەر پاڵکەوتم ، لەخەوما ئەبوبەکرم بینی لای قەبرەکەی پێغەمبەر (د.خ) وەستابوو ، فەرمووی: خۆشەویست دەفەرموێت: ئارامبگرە تۆ لەژێر چاودێری ئێمەدایت .

شێخ کوشك دوعای دەکرد خوایە بە ئیمامی بمژێنەو بە ئیمامی بمرێنەو لەسوجدەدا حەشرم بکە .

شێخ دووهەزار وتاری هەیەو چەندەها پەڕاویشی نووسیوە ، لەسەرەتای ساڵانی هەشتاوە نەیانهێشت وتار بدات ، داوای لێئەکرا میسر بەجێبهێڵێ ، ئەویش رازی نەبوو ساحەکە چۆڵ بکات (هەروەك چۆن سەیدی شەهید ونەورەسی رەحمەتیش رازی نەبوون ئەم میسرو ئەویش تورکیا بەجێبهێڵن).

رۆژێکی هەینی دەستنوێژی شت و نوێژی سوننەتی کرد تا پاش ئەوە بچێ بۆ مزگەوت ، لەدووەم سوجدەی ڕکاتی دووەمی نوێژەکەیدا ئاواتی هاتە دی و خوای گەورە ئەمانەتەکەی لێوەرگرتەوە .مەراسیمی کفن و دفنەکەی کەم وێنەبوو ،هەر لەعەسرەوە خایاندی تا دوانزەی شەو حکومەت خەمی لێهاتبوو ، دەسەڵاتداران وتبوویان :شێخ لەژیان و لەمردنیشیا مایەی سەریەشە بوو بۆمان .

## بۆخوا سوڵحاوان

زۆر جار بیردەکەمەوە ئێمە بۆ پێناگەین،هی وامان هەیە سی ساڵە نوێژ دەکات و ئێستاش نازانێت خەریکی چییە و لەشوێنی خۆی موراوەحە دەکات ،ئایا خەتای مامۆستاکانمانە یان خەتای باروزروفەکەیە یان خۆمان هیچمان لەباردا نیە ؟، سەعدی کوڕی موعاز پاش حەوت ساڵ ئیسلامەتی لەغەزای خەندەقدا قاچی برینداربوو،برینەکەی تووشی نەزیف بوو،بەوەش شەهید بوو،خۆشەویست (د.خ) فەرمووی : ئەوە کێیە وەفاتی کردووە عەرشی خوای بۆهاتە لەرزە(الله أکبر لەو پلەوپایەیە)..

لەدێیەکی قەراخەکەی خۆشمان پیاوێکی خواناسی نەخوێندەوار کەمامۆستا قورئانی بخوێندایەو هەڵەیەکی بکردایە،دەیووت : مامۆستا راوەستە هەڵەت کرد،لێیان ئەپرسی تۆ چووزانیت؟ هیچی نەدەووت و مامۆستاش هەڵەکەی خۆی راست دەکردەوە،ئیتر ئەمە جارودووجار نەبوو زۆر دووبارە ئەبۆوە،بۆیە زۆریان لێکرد بزانن ئەمەچیەو چۆن دەزانێت،ئەویش ناچاربوو وتی : کەمامۆستا قورئان دەخوێنێت نورێك و بەرەکەتێك ئەبینم کە هەڵە دەکات نامێنێ.

ئەم پیاوە باشە رۆژێك زۆری لەمامۆستا کرد یاسینی بخوێنێ مامۆستاش ناچار یاسینی خوێند، کەتەواو بوو ناوبراو گیانی سپارد. بەداخەوە زۆربەمان وەك مەحوی خەریکی مەسئەلەی دەورین و ئامادەنین بۆ مردن.

لەناکەس کاریا رۆیی بەبا عومرم      خودا بمژێنی تالەبەر قاپی کەسێ دەمرم

## روو کردنە قیبلە

مامۆستا (ئەنوەر)بۆی گێڕامەوە کاتێ لەسلێمانی فەقێ دەبێت، خەو براکەیەوە دەبینێت کەبراکەی لە شەڕی پەکەکەدا دەکوژرێت،بۆ باوکی دەگێڕێتەوەو باوکی دەچێت بۆلای زۆر تکاوڕجای لێدەکات بێتەوە ، نایەتەوە ، پاش دوورۆژ دەکوژرێت و کەس و کار دەیبەن بەو سندوقەی کە تیایا هێناویانەتەوە دەینێژن وئەم ناگات بەکفن و دفن کردنی براکەیدا،پاش چەند ساڵێك لەخەوا پیاوێکی ریش سپی بەمامۆستا ئەنوەر

**دەڵێت : بۆ نایەی بەلای (سەفەر)ی براتەوە و جەختی لێدەکاتەوە .ئەویش بەکەس و کاردەڵێت و قەبرەکەی هەڵئەدەنەوەو سەری سندوقەکە هەڵدەپچڕن دەبینێت لەسەر پشت چۆن دانراوە ئاوانێژراوە، رووی دەکاتە قیبلەو دای دەپۆشێتەوە .**

**جەمال ئەرمانیوس خەڵکی خوارووی میسرەو لەم ساڵانەی دوایدا لە تەمەنی ٣٨ ساڵیدا موسڵمان بوو پاش ئەوەی کە سی ساڵ لەکەنیسەدا خزمەتی کرد ودەڵێت : هەڵویستی دایکم سەیربوو، من لەتەمەنی هەشت ساڵیەوە دەمبینی کە دایکم لەبەیانیاندا گوێی لەڕادیۆ دەگرت بەتایبەت قورئان خوێندنی عبدالباست و ئەوانی تر، منیش پێم ناخۆش بوو و پێم دەوت: ئەو ڕادیۆیە بکوژێنەوە، ئەوە حەرامەو نابێت.**



**پێی دەوتم: نا کوڕی خۆم ئەوە کەلامی پەروەردگارە.**

**کاتێ چوم بۆلای لە (منیا) و، پێم وت: ئەمڕۆ موسڵمانبووم و هاتووم ئەو هەواڵەت پێ ڕابگەیەنم. .**

**وتی: ئاخ موسولمانبوونەکەت زۆر دواکەوت، لام سەیربوو وتم: بۆ؟**

**وتی: چونکە من دڵنیابووم کە چەند لەمەسیحیەتدا قوڵ ببیتەوە لەموسڵمانبوون نزیك دەبیتەوە، زۆر زۆری پێخۆش بوو و دوعای خێری**

بۆکردم و وتی: که ئەو زووتر موسڵمانبووە، ئەمەش وای کرد زیاتر پابەندبم و سووربم لەسەر ئیسلامەکەم.
من و دایکم زۆردڵمان وابەستەی یەك بوو، هەرچەند ئەولەشاری (المنیا) بوو کە٢٤٠کم لەمنەوە دووربوو، نەخۆش بوایە یەکسەر دڵم خەبەری ئەداو پەیوەندیم پێوە دەکرد، منیش نەخۆش بوومایە بەهەمان شێوە؟
جارێك لەخەستەخانە کەوتبووم و نەخۆش بووم، بەبێ ئەوەی کەس هەواڵی بداتێ بەتەلەفون بەژنەکەمی وت: جەمال لەچ خەستەخانەیەکە.
کە چووم بۆعومرە پێی وتم بەیانی جومعە عومرەیەکم بۆبکە، کە گەڕامەوە لەڕێ زانیم کە وەفاتی کردووە، کە چووم بۆسەر قەبرەکەی کە مەسیحیەکان ناشتبویان، خوا ئاگادارە قەبرەکەیم هەڵدایەوە، ئەوەی سەیربوو بینیم ڕووی کراوەتە قیبلە.

## حاجی رەوشەن:

لەهەڵەبجەی شەهید ئافرەتێك بەناوی رەوشەن لە هەشتاکاندا مێردەکەی دەمرێت و سێ چوار منداڵی سەروپێچکەی بەسەردا دەکەوێت ،هەموو ژیانی خۆی دەکا بە قوربانی گەورەکردنی ئەو منداڵە بێباوکانە، هەموویان بە هەر حاڵێك بێت پێدەگەیەنێت،لەو باروزروفەدا کە ئەوانەی باوکیان هەبوو بەزەحمەت دەژیان جاوەرە یەکێك باوکی نەبێت.

ڕەوشەن چووە حەج و ساڵی ٢٠١٢ ش چوو بۆ عومرە،هەمیشە دەیووت خۆمن دەزانم سەرپەرشتیاری منالّی بێباوك لە بەهەشتا هاوەڵی پێغەمبەرە(د. خ) بەڵام حەزدەکەم لە مەدینە لای ڕەسول اللە بمرم،سبحان اللە کاروانەکەیان لەپێشا چوونە مەککەو دواتر چوونە مەدینە،کاتێ ڕۆژوویان شکاند بەبێ ئەوەی هیچی بێت لەمەدینە وەفاتی کرد و ئاواتەکەی هاتە دی..

**دوا ساتەکانی شێخ شەعراوی** :

شێخ عبدالرحیم کوڕی شێخ شەعراوی باسی دوا ساتەکانی باوکی دەکات و دەڵێ:(١٨) ڕۆژ پێش ئەوەی باوکم کۆچ بکات خوشکەکەم خواردن ومیوەی بۆ دەبرد دەیگێڕایە دواوەو دەیووت ئێستا خواردوومە ،(٧) ڕۆژیش پێش وەفاتی ئاویشی نەدەخواردەوە ، بۆ چەند سەعاتیش بێهۆش دەبوو،کە بانگمان دەکرد نەبادا کۆچی کردبێ دائەچڵەکی ، بۆیە سامحی برام وتی : هەرکاتێ ویستت بزانی ماوە ، لەلایەوە قورئان بخوێنە دیارە هەڵەیەك هەردەکەی ، منیش ئەچووم بەدەنگی بەرز قورئانم لەلایەوە دەخوێند کە هەڵەیەکم دەکرد دەیووت : بوەستە هەڵەت کرد !

ڕۆژی یەکشەممە ١٩٩٨/٦/١٤ چوومە قاتی سەرەوە و باوکم بەجێهێشت ، کاتێکم زانی وەفای کچم بانگی کردم و وتی : باپیرم بانگت دەکاو دەڵێت :با ئوتۆمبیلەکە ئامادەبکات ! وتم : کچم چی پێووتی : وتی : پێی وتم : کوا باوکت ؟؟ وتم : لەقاتی سەرەوەیە ، وتی : بڕۆ پێی بڵێ ئوتۆمبیلەکە ئامادەبکات ، کەخەریك بوو بێم بۆلات وتی :وەرە ئەمڕۆ

چەندی مانگە ؟؟وتم : ١٤ی مانگە ،بەپەنجە ژماردی و وتی : ئا ١٥ و ١٦ ئاھ ١٧ ، ئنجا وتی : ئەی چەند شەممەیە ؟؟ وتم یەکشەممەیە ، وتی : یەکشەممە ، دووشەممە ، سێ شەممە، ئا بەباوکت بڵێ با خێرا ئوتومبیلەکە ئامادە بکات ..

منیش نەچووم بۆلای و یەکسەر چووم بۆلای (عبدالرحمان)کەسەرپەرشتی کارەکانی باوکمی دەکرد پێمووت : قەبرەکە ئامادەبکە لەو جێگایەی کە پێم وتی ! وتی : چی بووە ؟؟ وتم : هیچ نەبووە ئیشارەتەکە گەیشت .

کەهاتمەوە لای وتی : بەعبدالرحمانت وت ؟؟ وتم : بەڵێ ! فرمێسك بەچاویەوەبوو ،وتی :چاکت کرد ، تێم گەیشتی بووی بەپیاو؟ (خوشك و براکانم وایان دەزانی مەبەستی ئامادەکردنی ئوتۆمبیلە)،وتی : واز لەوان بێنە تێناگەن و ئەوان هێشتا هەر قوتابین !!

دووشەممە سەعات دوانزەی شەو وتی : بمبەن بمشۆن ، ئێمەش لەگەڵ براکەمدا چاك شتمان و وتی : جلی تازەم بۆ بهێنن ،سەرتاپا جلی تازەی لەبەرنەکراومان هێناو عەبایەکی سپی تازەی هاوینەشی دا بەشانیدا ، وتم : بابە چیە ئەڵێی زاوایت ؟؟ وتی : بەڵێ!

کوڕەزایەکیشی بانگ کرد نینۆکی بۆکردو چوینەوە ژوورەکەی خۆی ، سەعات سێی شەو وتی : بەجێم بهێڵن با لەگەڵ خوای خۆما بم ، شەش ونیوی بەیانی خەبەرم بۆوە هاتمە خوارەوە سەیردەکەم فاتیمە ی خوشکم دەگری !وتم : چییە بۆدەگریت ؟؟وتی : چووم دەرگاکەم کردەوە لەپڕ

ئەویش وتی : برۆ دەرەوە ! وتم :چۆن لەدەرگات نەدا مەگەر لەمناڵیەوە فێری لەدەرگادانی نەکردووین !!
بەیەکەوە لەدەرگامان داو چوینە ژوورەوە لەسەر قەرەوێڵەکەی دانیشتبوو ، وتم : پاڵەوان ئێستا چۆنی (زۆرجار سوعبەتم لەگەڵ دەکرد ) ، وتم : فاتیمە وادەڵێ ، وتی : ئاخر من لەکۆڕێکدابووم خۆی کرد بەژووردا ئەو نەیدەبینین خەریك بوو پێیان پیابنێت !!
دوای ئەوە قاچی راکێشا لەسەر قەرەوێڵەکەو ناوی ئەولیاکانی دەبرد و ئەی وت: ئەهلەن سەیدنا ئیبراهیم ، ئەهلەن سەیدە زەینەب ، ئەهلەن سەیدنا حسێن ، لەپڕ سەیری سوچێکی ژوورەکەی کردو وتی : الله الله کەی من شایانی ئەو هەمووەم ئەوا من هاتم تۆ بۆ تەشریفت هێنا (أشهد أن لاالە الا الله وأشهد أنك رسول الله ) دیاربوو خۆشەویست (د.خ)هاتبووە بەرچاوی ، ئیتر گیانی سپارد..

**کەراماتی شەعراوی** :
شێخ متەوەلی شەعراوی بەڕاستی ئەهلی قورئان بوو ، بۆیە بووە ئەهلی تایبەتی خوا ، چەندەها کەراماتی هەبووە کەهەندێکی خۆی باسی کردووەو هەندێکیشی خەڵکی باسیان کردووە کەلێیان بینیوە .
لە دەرسێکی تەفسیردا(کە ٩٠٠ سەعات تەفسیری هەیە) باسی بەشێکی سورەتی ئەحزاب و غەزای خەندەق دەکات ، بۆ دەرسی داهاتوو دەڵێت : دوێنێ لەم مزگەوتەدا باسی غەزای خەندەقمان کرد ، ئەمشەو

لەخەومدا من و ئێوەو خەڵکانێکی زۆری تریش وائەزانم ئەوانەن کە بینیویانین لە تەلەفیزیۆندا ، بەشداری غەزای خەندەق بووین ، سەعدی کوڕی موعازم بینی ، وتی (حەیان کوڕی قەیس ) شمشێرەکەی لە قۆڵم دا ،هەروەها (عەمری کوڕی قەیسم) بینی کەسێکی کەتەی زل بوو لەشێوەی شەیتاندا هاواری کرد کێ ئازایە بێتەمەیدان ، پێشەوا عەلی دووجار ویستی بچێ خۆشەویست نەیهێشت ، سێیەم جار کە ئەو داوای کرد وعەلیش ویستی بچێ خۆشەویست رێی داو پاش ماوەیەك شەڕکردن پێشەوا عەلی کوشتی، وتیان بۆ درعەکەیت نەهێنا کەباشترین درعە لەناو عەرەبدا ؟؟

وتی: نەمهێنا بۆ ئەوەی عەورەتی دەرنەکەوێت . هەروەها حوزەیفەی کوڕی یەمان و چوونی بۆناوکافرەکان هێنانەوەی هەواڵ بۆ خۆشەویستمان ئەمانەوزۆرشتی ترم بینی ،کەسوپاس بۆ خوا ئەوەی دوێنێ بەکەم و کورتی باسمانکردبوو لەخەوەکەدا بەتەواوی بەدەنگ و رەنگ بینیم.

هەروەها دکتۆر حەسەن راتب کە پارێزگاری سینا بوو وتی : تۆمەتێکیان بۆ دروست کردم و بە شێخم وت: بەتەمام وازبهێنم. وتی : نوێژی ئیستخارەبکە ، وتم : حەزدەکەم تۆ بۆم بکەی ، وتی : باشە . بۆسبەی کەبینیمەوە وتی :ئەمشەو نوێژی ئیستخارەم بۆکردی و نووستم پێش نوێژی بەیانی خەوێکم بینی و دوای نوێژی بەیانیش خەوێکی تر ، وائەزانم تادەساڵی ترهەموو کێشەکانت چارەسەر دەبن و تۆ لەسینا نان دەبەخشیتەوە ، کەخەوەکە هاتەدی وەرە پێم بڵێ ، ئەگەر مردبووشم وەرە سەرقەبرەکەم پێم بڵێ کەهاتۆتە دی ، خواشایەتە هەرووەك چۆن تەفسیری

کرد هاته دی و وەفاتی کردبوو چوومە سەرقەبرەکەی وتم : یاشێخ لێکدانەوەکەت تەواودەرچوو .

خوێنەری بەرێز بەڕاستی هەروەك سەروەرمان دەفەرموێت :خوا هەندێ کەس بەم قورئانە بەرزدەکاتەوەو کەسانێکی تریش کە پەیڕەوی ناکەن نزمیان دەکاتەوە ، با لەخۆمان بپرسین ئاخۆ هەریەکەمان لەکام دەستەوتاقمین ؟؟من بۆ خۆم وائەزانم زۆرم ماوەو وەك مەحوی دەڵێم:

چیبکەم نە ئەوکەسەم کە کەسم بێ لەلا بەکەس

خۆشم نەگەیمە ئەو کەسە ئەومن بکا بەکەس

## لەسەرەمەرگدا بەهەشتی بینی :

قازیەکی سعودی دەڵێت : باوکم پیاوێکی خواناس بوو ، تووشی شێرپەنجەبوو ، زۆرحاڵی خراپ بوو، لەخەستەخانە لەژێر چاودێری پزیشکیدا بوو ، لەهۆش خۆی چوو بوو لەغەیبوبەدابوو ، کەچی بەوحاڵەوە لەبەرخۆیەوە وەسفی بەهەشت و کۆشکەکانی و ڕووبارەکانی و دارەکانی زۆر بەوردی دەکرد ، یا ئەوەبوو بەبەهەشتا پیاسەدەکات ، یان دەتووت کتێبی ئیبن قەیم دەخوینێتەوە ،زۆر سەیر بوو بۆیە بەڕێوەبەری نەخۆشخانەو پزیشکەکان و پەرستارەکان هاتن و کەئەم حاڵەیان بینی لەگەڵ ئێمەدا ئەگریان ، لەپڕ باوکم هاتەوە هۆش خۆی و ئەم هەمووەی بینی لەدەوری وتی : ئەوە بۆدەگرین ؟؟ گریانی ناوێ بەخوا من ئەهلی بەهەشتم ، ئیتر سەیری بنمیچی ژوورەکەی کردو وتی : نوور ،نوور ،

چەند نوورانین ، أشهد ان لاالـه الا الله وأشهد أن محمدا رسول الله  و ئیتر گیانی سپارد.

## ئەجەلی سەیرهەیە ئامادەی؟؟

شێخ نوری شێخ عومەرکە لـەساداتی پیرخدری یە و لـەسلێمانی دائەنیشێت ، ئەمڕۆ ٢٠١٤/١/٢٤بۆی گێڕامەوە وتی :

١- لـەساڵی ١٩٧٨ دا لـە بنگرد بەڵێندەربووم، رۆژێك هەواڵ هات کەدایکی کرێکارێك مردووە ، منیش چووم بەدەمیانەوە ، پیرێژنەکە شۆراو کفن کرا و قەبری بۆ ئامادەکرا نەیان ناشت تا کوڕێکی هەبوو لـە قەزای دوکان بگەڕێتەوە ، کوڕە کەهەواڵـەکەی بیستبوو بە ئوتومبیلێك دەگەڕێتەوەو لـە رێگا وەردەگەڕێت و دەمرێت و تا هێنایانەوە دایکە جووڵـەی تێکەوت و زیندووبووەوەو کوڕەکەیان لـە قەبرەکەیدا ناشت .

٢- چووم بۆ تەعزیەیەك برادەرێکم لـەبەرم هەستا بەناوی عەلی ساڵح کوردە تا شوێنەکەی بدات بەمن ، منیش حەزناکەم کە کەس جێم بۆ چۆڵ بکات ، بۆیە چوومە پشتەوە ، ئەویش پاش کەمێك رۆیشت ، دوای تۆزێك برادەرێك هاتە لامەوە وتی : ئەزانی ئێستا عەلی ساڵحی کوردە چووەسەیارەکەیەوەو ویستی سلف لێبدات گیانی دەرچوو .تاس بردمیەوەو وتم : سبحان الله خۆ ئێستا لێرەدا بوو .

## ئەوبانگخوازەی هەموو سۆدانیەکان بۆی گریان

**شێخ محمد سيد الحاج ، ساڵی ١٩٧٢ لەدێیەکی سۆدان لەدایك بووە، کۆلیژی شەریعەی زانکۆی ئوم دورمانی ئیسلامی تەواوکردووەلەساڵی ١٩٩٨ دا .**

**کەلە پۆلی دووی ناوەندی بووە وتاری داوە لەوانەی مزگەوت و لەنوێژی هەینیدا .**

**لەدوا وتاری هەینیدا دەڵێت : هەینی داهاتوو لەلاتان نابم ، هەروەك دڵی خەبەری دابێت ..ناوبراو باسی کەسانێك دەکات کەسەرقاڵی چەندەها پرۆژەی گەورەن و نازانن چەندرۆژێکی کەمیان ماوە لە دونیادا و ، باسی هاوەڵێکی دەکات کەنامەی دکتۆراکەی پیشکەش بە موشریفەکەی دەکات و بەکارەساتی ئوتومبیل دەمرێت و فریا ناکەوێت موناقەشەی نامەی دکتۆراکەی بکات ، سبحان الله خۆشی نامەی ماستەرەکەی دابوو بە سەرپەرشتیارەکەی دووڕۆژ پێش موناقەشەکەی لە ٢٠١٠/٤/٢٤ بەرووداوی هاتوچۆ بەهۆی خەولێکەوتنی سایەقەکەیەوەگیانی لەدەست دا لەتەمەنی ٣٦ ساڵیدا .**

**بەو لاوێتیە یەکێ بووە لەکۆمەڵەی ئەنصاری سوننەو چەند پەڕاوی نووسیوە :**

١. الحروب الصليبية بين الأمس واليوم.
٢. الحسبة مسؤولية الجميع.
٣. فقه الائتلاف.
٤. حكم الاحتفال بالمولد النبوي.
٥. لماذا لا ألتزم؟

٦. رمضان فضائل وآداب وأحكام

**هەروەها ئەم پۆستانەی بووە:**

١. مساعد الأمين العام للشئون الخارجية لهيئة علماء السودان.
٢. عضو المجلس الاستشاري لوزارة الأوقاف والشئون الإسلامية بالسودان.
٣. عضو المجلس الأعلي للدعوة الإسلامية بالسودان.
٤. أمين أمانة التخطيط والموارد البشرية لمنظمة سبل السلام الخيرية.
٥. وكان إمام وخطيب مسجد المؤمنين بحي الصافية حتى قبيل وفاته.

**ئەم زانا پایەبەرزە بەتوانایە بە مردنی هەموو سۆدانیەکان بۆی گریان.**







**حاجی ئەحمەد ئەبوشادی :**

**ناوبراو یەکێکە لەبرا تێکۆشەرە دێرینەکانی میصر ، ساڵی ١٩٢٨ لەدایك بووە ، ساڵی ١٩٤٧ پەیوەندی کردووە بە برایانەوە ، ساڵی ١٩٥٤ گیراوە بۆ دووساڵ ، ساڵی ١٩٥٨ لیسانسی وەرگرتووە لە یاسادا ،لەساڵی١٩٦٥ دەگیرێتەوە تاساڵی ١٩٧١ ، ئەو سزایەی ئەوان کەدراون وێنەی کەمە لە مێژوودا ، پاش بەربوونی ئەچێت لە کوەیت**

کاردەکات ، لەساڵی ۱۹۹۰ دەگەڕێتەوە میصروبەردەوام دەبێت لە بانگەوازداو بۆ تاقە سەعاتێکیش دەعوە بەجێناهێڵێت ، دوعاش دەکات لە کاتی دەعوەکردندا گیان بسپێرێت ، تەمەنی ۸۲ ساڵ دەبێت ، بەو هەموو نەخۆشیەی کەهەیبوو بەو پیریە ڕۆژێك چوو سێ وتاری لە سێ شوێنی جیا دا ، زۆر ماندووبوو ، بردیانە خەستەخانە ، کەکوڕەکەی چووە لای وتی : هیوادارم خوا ئەوەم بەشەهادەت لێوەرگرێت کەمن لەدەعوەدا وام لێهاتووە .

بەم جۆرە لە ۱٥ ی فیبرایر ۲۰۱۰ کۆچی دوایی کرد.

ڕەحمەتی دەڵێت : پەیمانم بەخوا دابوو کەنوێژی بەیانی بەردەوام بە جەماعەت بکەم ، کارم باش بوو قاتی خوارەوەی باڵەخانەیەك کرابوو بەمزگەوت و بەیانیان ئەچووم پێش نوێژیم بۆ دەکردن، ماوەیەك ساردبوومەوەو نوێژی بەیانیم دەکرد بەڵام دەچووم بۆ مزگەوتێکی تر تا نوێژ خوێنانی مزگەوتەکەی پێشتر گلەیم لێنەکەن .شەوێکیان لەخەوما مردم و بردیانم بۆ سەرقەبران و ناشتیانم و هەستم کرد خەڵکەکە بەجێیان هێشتم ، پیاوێکی بالأبەرز کە دۆسیەیەکی لە بن باڵدا بوو هات و وەك ئەفسەرەکان دارێکیشی بەدەستەوە بوو، وتی: نوێژی بەیانیت بەردەوام کردووە ، نەمئەزانی چی وەڵام بدەمەوە ، خۆ لەراستیشدا نوێژی بەیانیم نەچووە ، وتم : بەراستی بەردەوام نا ، بە لەهجەیەکی توند وتی : باشە . خەبەرم بۆوە ، کاتی نوێژی بەیانی بوو ، لەمزگەوتەکەی خۆمان پێشنوێژیم

بۆکردن ، کەوتنە گلەیی کەبۆماوەیەکە دیارنیم ، منیش وتم : لە قیامەتەوە هاتوومەتەوەو خەوەکەم بۆ گێڕانەوە .



دکتۆر خالیدی کوڕی کەئەمیش بانگخوازە دەڵێت : باوکم تەنانەت لە کاتی نەخۆشیەکانیشیدا ئاگاداری نوێژەکانی بووە ، یەکجار نەبێت کەلەبەر ئازاری زۆر نوێژەکەی دوادەکەوێت و بۆ چەند چرکەیەك خەوی لێدەکەوێت ، لەخەویا مەلائیکەت بەپەلە ئاوی لەبەهەشتەوە بۆ دێنیٚ و دەستنوێژدەشواو نوێژەکەی دەکات !!رەحمەتی خوا لە حاجی ئەحمەد و هەموو تێکۆشەرانی ڕێی خوا .

## عاقیبەت خێریی:

کاك خالید جاف دەڵیٚ : لە مەجلیسی پرسەیەکدا بووم، بەڕێز مامۆستا مەلا (عبداللە)ی جیهاد پێشنوێژو وتارخوێنی مزگەوتی نوور لە سلێمانی کە

پیاوێکی راستگۆیە ئەم بەسەرهاتەی بۆ ئامادەبوان گێڕایەوەو سوێندی خواردو فەرمووی قەسەم بە پەروەردگار چۆنتان بۆ دەگێڕمەوە ڕێك و رەوان روداوەکە ئاوهایە:

مامۆستا فەرمووی چەند ساڵێك بەر لە ئێستا دۆستێکم تۆزێك ناساغ و نەخۆش کەوت بەڵام نەخۆشیەکەی هی ئەوە نەبوو کە پێشبینی مردنی لێبکرێت، رۆژێکیان چووم سەردانیم کرد لە ماڵەوەو ئەحواڵی تەندروستییم پرسی کاتێك ویستم هەستم و برۆم ئەو دۆستەم داوای لێکردم و وتی مامۆستا ئەگەر ئاساییەو بۆت ئەگونجێ زۆرم پێخۆشە ئەمشەو لەلای من بمێنیتەوەو لە خزمەتدا بم، وتی منیش وتم وەڵا مادام پێتخۆشە ئەوە منیش لە خزمەتتام ئەمشەو بۆخۆمان پێکەوە ئەبین... مامۆستا وتی شەو پێکەوە دەسمانکرد بەقسەو باس و دەمەتەقێ تا شەوانێکی درەنگ، لە پڕ کابرا وتی مامۆستا حەزەکەم یاسینێکم بخوێنیت (سورەتی یاسین)، ئەڵێ منیش وتم بێقەزا بی یاسینی چی خۆ تۆ شوکور وەزعت زۆر باشە، وتی نەبەخوا زۆر حەزەکەم بۆم بخوێنیت، مامۆستا وتی وەڵا منیش دڵیم نەشکاند سورەتی یاسینم بەسەریدا خوێندو تەواو بووم، کەمێکی پێچوو کابرا بە دەنگی بەرز هەر لە خۆیەوە وتی (وعلیکم السلام ورحمە اللە)!!!ئەڵێ منیش زۆرم بەلاوە سەیر بوو وتم ئەوە لەگەڵ کێتە ئەو سەلامە خۆ بەس من و تۆی لێیە؟ وتی کوڕە میوانمان هاتوە مامۆستا بۆ هەڵناسیت لەبەریان؟ وتم وەڵا من کەس نابینم میوانی چی برا؟! وتی چۆن نایبینی ئەو هەموو میوانەت نەبینیوە؟ وتم نەبەخوا، وتی دەوەڵا ئەوە یەك کۆمەڵ میوانن

هاتوون و قەڵەم و کتێبیان بەدەستەوەیە!!! ئەڵێ ئەم قسانەی کردو منیش لێی نزیك بومەوەو چومە سەر سەری، بینیم پەنجەی شایەتومانی بەرزکردەوەو بە پێکەنینێکەوە وتی خوایە گیان من لەسەر دینی محەممەدم ((اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمد رسول الله)) و کابرا هات بەلادا، دەستم دایە تەماشام کرد گیانی دەرچوەو وەفاتی کردوە.

**وانەیەك لەژیانەوە:**

لاوێك کە هێشتا لە مانای ژیان تێنەگەیشتووە ، دەچێت بۆلای حەکیمێك کە بەسەر بەرزاییەکەوە کۆشکێکی نایابی هەبوو ، حەکیمەکە کەوچکێکی ئەداتە دەست کە دوو دڵۆپ رۆنی لەسەرە و ئەڵێ برۆ بەکۆشکەکەمدا بگەڕێ و سەیری هەموو تابلۆو دیمەنە جوانەکانی بکە، بەڵام وریابە ئەو دوو دڵۆپ رۆنەت لێنەڕژێ، ئەویش دەچێت سەعاتێك بەناو کۆشکەکەدا دەسوڕێتەوەو لەتاو ئەوەی کە دوودڵۆپەرۆنەکە نەڕژێت ناپەرژێتەسەر وردبوونەوە لە تابلۆ جوانەکان و دیمەنە سەرنجڕاکێشەکان ، بۆیە کەدێتەوە بۆلای ، حەکیمەکە لێی دەپرسێت چیت دی ؟؟ دەڵێت : هیچ !

دەڵێ :دەئەمجارە برۆ سەیربکەرەوە ، ئەمجارە کەدەچێتەوە بەچاکی سەرنجی شتەکان دەدات وکەوچکەکەی دەستی بیردەچێتەوە بۆیە کەدێتەوە راستە دیمەنەکانی بەچاکی بینیون بەڵام دوو دڵۆپ رۆنەکەی لێڕژاوە ..

جا ژیان ئەو هاوسەنگیەی دەوێت کەزۆرکەس بەداخەوە تێی نەگەیشتووە ، سەرقاڵبوونمان بەلایەنێکەوە سەدان دیمەن و جوانی دونیاو قیامەتمان

لەکیس ئەدات ، بۆیە خەڵکانێکی زۆر دێنە دونیاوەو پاش تەمەنێکی زۆرئەم ژیانە بەجێدەهێڵن و هیچ حاڵی نەبوون و هیچیان بۆ نەکرا .

هەیە زۆر قوڵ دەبێتەوەو بەدوای شتێکدا دەگەڕێت کە هەرگیز نایگاتێ وەك ئەو کەسەی کەلەرمێکی بەدەستەوەیەو گەڵا لەدوای گەڵا پاکی دەکات بەهیوای ئەوەی بگاتە کرۆکەکەی ، لەکاتێکدا هەمووی گەڵایەو کرۆکی نیە !!یان ئەتوانین بڵێین هەمووی هەرکرۆکە وسوودی لێوەرگرەو گەڵاکان خەسارمەکە .

بەڕاستی ژیان کورتە ، کیسەڵێك سێسەد ساڵ ئەژی و ئێمەی داماو شەست ساڵێك دەژین ! کەچی بەوەشەوە کەم کەس لەمانای ژیان تێگەیشتوون و خۆیان دۆزیوەتەوەو ئەزانن بە راستی خەریکی چین !

ئەم حاڵەتەش نالی شاعیر دەڵێت :

هەرچەندە کە عومری خضرو جامی جەمت بوو

چونکە ئەمەلت زۆرە ، چ عومرێکی کەمت بوو!

ئەی جامیعی دونیاو قیامەت  بەخەیاڵات

ئەو رۆژە کەمردی ، نە ئەوت بوو نە ئەمت بوو!

دوێنێ چ بوو دەتدا بەزوبان لافی کەرامەت ؟

ئەمڕۆ نەدەمت بوو ، نەدەمت بوو ، نەدەمت بوو !

واتە: هەرچەند عومری خدری زندەشت بۆ بنوسرێت ،وەك جەمشید خاوەن شکۆو پایەبی (کەگوایە ئاوێنەیەکی بووە هەموودنیای تیابینیوە ) مادام هیواو ئاواتت زۆرە ژیانت کورتە.

تادوینیٚ بوولاف و گەزافت لێدەداو کەست بەهیچ نەئەزانی ، ئەمڕۆ کەرووبەڕووی مەرگ بوویتەوە ، پەشیمان بوویت لەو لاف و گەزافەت و هەناسەت بۆنەدراو دەمت گۆی نەکرد.لا٣٦٨ دیوانی نالی.

## هاوسەنگی وگرنگی دان بەهەموولایەنێك

پیاوێك ئەچێت بۆلای دانایەك و دەڵێت : من پێریٚ کاتژمێر حەوتی بەیانی چووم لەو دارستانە تا پێنجی ئێوارە پێنج درەختم بڕیەوە بەتەورەکەم ، کەچی دوێنیٚ لە پێنجی بەیانیەوە رۆیشتم و تا پێنجی ئێوارە بەهەرحاڵێك بوو چوار دارم بڕیەوە، ئەمرۆش بەهەمان شێوە زوو چووم و تا ئێوارە سیٚ دارم بۆ بڕایەوە نازانم هۆکەی چیە؟؟ ئەویش وتی : برام راستە تۆ زووتر چوویتە سەرکارو زۆرتر خۆت ماندووکردووە ، بەلاٚم بیرت چووە تەورەکەت تیژ بکەیتەوە !!

بەڕاستی ژیانیش وایە لەگەرمەی ئیش و سەرقاڵیماندا هەندیٚ شتمان بیردەچێت کارەکان وەك پێویست نایەن بەدەستمانەوە.

لەژیاندا هاوسەنگی مەسەلەیەکی زۆرگرنگە بۆنموونە :

١-ئەوەی هاوسەنگی نەبێت لەخواردن و جۆری میوەکاندا تووشی کەمی فیتامینات دەبێت، ئەوەی زۆر گۆشت بخوات تووشی (داء الملوك )دەبێت .

٢-ئەوەی هەقی هەموولایەنێك نەدات بێ فەرمانی ئیسلامی کردووە کەخۆشەویست دەفەرموێت (اعطوا كل ذی حق حقه ) هەقەکان بریتین لە ، هەقی خوا ، هەقی دایك و باوك ، هەقی ماڵ و مناڵ ، هەقی نەفسی خۆت، هەقی میوان ، تەنانەت هەقی رێگا ، هەروەك لەفەرموودەدا هاتووە.

٣-گرنگی دان بەجەستەو رۆح ، گرنگی دان بەدونیاو قیامەت .

## ڕاحەت نیە لەدونیادا :

پاش ٥٥ ساڵ تەمەن و ٤١ ساڵ خوێندنەوەو بانگەوازکردن حیکمەتێکی زانایەکی خواناس زۆرکاری تێکردم کە دەڵێت : داوای شتێ مەکە کە خوا خەلقی نەکردووە .

خوای گەورە پشوو ڕاحەتی لەم دونیایەدا دروست نەکردووەو پشوو راحەتی تەواو لەقیامەتدایە ، تۆ کەداوای دەکەیت لەدونیادا ، داوای شتێك دەکەیت کە لەدونیادا نیە ، هەروەك ئەوکەسەی کەداوای نەمری دەکات لەدونیادا ،راستە هەموو لەناخماندا حەزمان بەنەمری یە بەلاّم نەمری لە قیامەتدایە ، خوای گەورە بەخۆشەویست (د.خ) دەفەرموێت

﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِنْ قَبْلِكَ الْخُلْدَ أَفَإِنْ مِتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ (٣٤) كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَنَبْلُوكُمْ بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ (٣٥)الانبياء.

دونيا شويَنى هەولْ دان و ڕاكە ڕاكەومرۆڤ ڕەنجبەرە ﴿يَا أَيُّهَا الْإِنْسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ (٦)الانشقاق﴾..

دونيا بۆيە شويَنى پشوودان و راحەت نييە چونكە خوا بۆ تاقيكردنەوەى ئيَمەبەديهيَناوە تا دەركەويَت ، كىَ ئارامدەگريَت و باشترين كاردەكات : تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (١) الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ (٢)الملك.

برادەريَكى دكتۆر كورە تەمەن حەوت سالأنەكەى هيَنابوو كەتووشى شيَرپەنجەى خويَن بووبوو ، ئافرەتيَك چەند سالَە بەتەماى منالَە،كەچى كەسكى كرد كۆرپەلەكەى ناوسكى شەش مانگ بوو لەسۆنەردا دەركەوت كە منالَەكەى زۆرنوقسانەو دەبيَت لەبارى ببات و بەناچارى لەبارى برد.

دیاره جوانی وناشرینی شتێکی ڕێژەییە ، بەڵام دیقەت بدەن کە بەملیۆنەها کەس بەتایبەت ئافرەت بەحساب خەم لەناشرینی خۆیان دەخۆن ، کەچی سبحان الله جاری واهەیە ناشرینەکە زۆر بەختی باشترە لە جوانەکە .

ئەوەی گرنگە لەم تاقیکردنەوانەی دونیادا ئەوەیە کە ئارامبگرین و سنووری ئەدەب نەشکێنین لەگەڵ خوادا ، خوای گەورە بەئاشکرا دەفەرموێت کە خۆیەتی کوڕ یان کچ یان کوڕو کچ ئەبەخشێت وهەندێکیش نەزۆك دەکات ، کەچی هەندێك نایانەوێت لەم ڕاستیە تێبگەن و خوا لەخۆیان زویر دەکەن ، پیاوێك لەم شاری سولەیمانیە بەژنەکەی دەڵێت : کوڕت نەبێت قۆڵت لەبنا ئەبڕمەوە ، خوا کوڕێکی دایە قۆڵێکی نەبوو ..

فاتیمە لە کاتی نەخۆشیەکەی خۆشەویستدا وتی : ئای لەو نارەحەتیی و ئێش و ئازارە ، خۆشەویست هاتەوە هۆش خۆی کەتایەکی زۆری هەبوو فەرمووی (لاکرب علی أبيك بعد اليوم ).

## ئەم دونیایە فرسەتە :

خۆشەویست بەلای گۆڕێکدا ڕۆیشت فەرمووی (ركعتان خفيفتان مما تحقرون أو تنفّلون، يزيدها هذا –يشير الى القبر–في عمله أحب اليه من بقية دنيكم ) السلسلة الصحيحة، ح ١٢٨٨ .

واته ئەو کەسەی لەو گۆڕەدایە دووڕکات نوێژی سادەتان یان سوننەتتان زیادببێ بۆ کردەوەکانی نایگۆڕێتەوە بەهەموو دونیا .

مرۆڤ پیر دەبێ و دوو حەزوو ئارەزووش پیردەبن لەگەڵیدا ، حەزکردن بەماڵ وسامان و تەمەن درێژی (هەروەك لەفەرموودەی موسلیم دا هاتووە:يهرم ابن آدم وتشب معه اثنتان : الحرص على المال ، والحرص على العمر)

یادی مردن زەروورە بۆ ئەوەی مرۆڤ بێنێتەوە تایم ، ئەگەر لە تەنگانەو کەم دەستیدا بوو دڵخۆش دەبێت و دونیا فراوان دەبێت لەبەرچاوی وە ئەگەر خاوەن ماڵ و سامانی زۆر بوو لەخۆی بایی نابێت و لە سنوور دەرناچێت:(أكثروا ذكر هادم اللذات : الموت ، فانه لم يذكره أحد في ضيق من العيش الا وسعه عليه ، ولا ذكره في سعة الا ضيقها عليه )صحيح الجامع الالبانی ۱۲۱۱ /حسن

سەردانی گۆڕستان ، مردوو شتن ، نوێژ لەسەر مردوو ، مرۆڤ رادەچڵکیچنن و وای لێدەکەن خەمبار بێت و خەمی قیامەتی بخوات .هەروەك لەفەرموودەدا هاتووە (زر القبور تذكر بها الآخرة ، واغسل الموتى فان معالجة جسد خاو موعظة بليغة ، وصل على الجنائز ، لعل ذلك يحزنك ، فان الحزين في ظل الله يوم القيامة ).صحیح /الحاكم فی

المستدرك. حەسەنی بەصری دەیووت :دەست و برد بکەن ، دەست و برد بکەن ، هەمووی هەناسەیەکە کەنەهات نایەت و ئیتر کاروکردەوتان بۆناکرێت تا لـەخوا نزیك ببنەوە .

خوا رەحم بەکەسێك بکات بەخۆیدا دەچێتەوەوبۆ گوناهەکانی دەگری .

ئنجا ئەم ئایەتەی دەخوێند (انّما نعدُّ لهم عَدّا )مریم ٨٤ پاشان دەگریاو دەیووت :دوا ژمارەت رۆح دەرچوونە ، دوا ژمارە بەجێهێشتنی کەسوکارە ،دوا ژمارە چوونە ناو گۆڕە .

بەراستی زۆربەمان هەموو شتێکمان بیرە مردن نەبێت و ، مردنیش تەنها ئێمەی لـەبیرەو رەنگە ئەوەندەمان نەمابێ و هاکا فریشتەی گیان کێشان بووە میوانمان (أَوَلَمْ يَنْظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ وَأَنْ عَسَى أَنْ يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ (١٨٥) الاعراف ..

**مردن هیچی لەگەڵ ناکرێت:**

مردن لـەناکاو دێت و منالٚ و گەورەو دەولـەمەند وهەژارو خاوەن دەست و بێدەست وەك یەك دەبات ، نەسەروەت و سامان ، نەداوودەرمان مردن

دواناخەن ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ (٣٤)الاعراف.

وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِمَا كَسَبُوا مَا تَرَكَ عَلَى ظَهْرِهَا مِنْ دَابَّةٍ وَلَكِنْ يُؤَخِّرُهُمْ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِ بَصِيرًا (٤٥) فاطر.

خوا حیلمی هەیەو مۆڵەت ئەدات ، رزقی هەمووان ئەدات تەنانەت ئەگەر بێبڕواش بن ، چونکە دونیا بۆ تاقیکردنەوەیەو لەقیامەتدا لێپرسینەوە دەکرێت .خۆئەگەر خوا خەڵکی بەهۆی گوناهەکانیانەوە سزا بدایە لەدونیادا ئەواکەس نەئەما لەسەرزەوی ، بەلاٌم مۆڵەتیان ئەدات هەتا ئەجەلیان دێت و ماوەی تاقیکردنەوەکەیان تەواو دەبێت وئاگاداری هەموانەو دەیانبینێت .

ساقیب صەبانچی لەتورکیا ملیاردێربوو قەرزی ئەدا بە حکومەتی تورکی ، کە لەئەمریکا نەخۆش بوو دوو وەسێتی نووسی و داوای کرد کە لەکاتی شتنیدا یەکەم بکرێتەوە ولەدوای ناشتنیشی دووەم بکرێتەوە ، کاتێ مردو هێنایانەوە بۆ تورکیا ، یەکەمیان کردەوە نووسرابوو تکایە جووتێ گۆرەویم لەپێ بکەن ، بەمەلایان وت: وتی : جائیز نیە ، بەبێ گۆرەوی ناشتیان ، کەهاتنەوە دووەمیان کردەوە کە نووسرابوو : دونیایەك بەو هەموو

سەرووتەوە نەتوانی جووتێك گۆرەوی لەگەڵ خۆتا ببەیت ، هەقە مرۆڤ دەرسی لێوەرگرێت .

هەروەها شێخ راجحی لە سعودیە تەمەنی ٨٢ ساڵەو شەش ملیار دۆلاری هەبوو ، سیانی بەسەر منالەکانیدا دابەش کردو سیانیشی دا بە کۆمەڵەیەکی خێرخوازی کە بیخەنە کارەوەو خێری پێبکەن ، داواشی لێکردن کەبەخێری خۆیان تادەمرێت بیژێنن لەوپارەی خێرەو وتی : حەزدەکەم بگەمەوە بەخوا دینارێکم نەبێت .

## دکتۆرو دەرمان ومردن :

کەس نیە وەك پاشاکان و سەرۆکەکان خەمی ژیانیان بێت و هەریەکەیان هەزار ساڵ بژی بەکەمی دەزانێت ، بۆ ئەمەش دکتۆری شارەزاو ناودار هەمیشە لەخزمەتیاندان ، کەچی یەك هەناسە ئەجەلیان دواناکەوێت وهەروەك ئەوکەسە دەمرن کە بێکەس و بێدەرە و هیچ دەسەلاتێکی نیە.

پرۆفیسۆر یەفغینی چازۆف کە بەناوبانگترین پزیشکی دڵی رووسیە لەکتێبەکەیدا (تەندروستی و دەسەلات) دا دەڵێت : عبدالناصر ئازاری قاچی هەبوو دەمارەکانی قاچی باش ئیشیان نەدەکرد ، هاتە لامان بەهۆی کانیاوە گەرمەکانی جۆرجیاوە چاکمان کردەوە ،عبدالناصر دڵیشی تەواو نەبوو زۆر ئامۆژگاریمان کرد کە خۆی ماندوونەکات ، ناوبراو سێ دکتۆری بیانیش جگە لەدکتۆرە میسرییەکان هەمیشە لەخزمەتی

تەندرووستیدا بوون ، سەرۆکی رووسی و موخابەرات من و چەند دکتۆرێکی تریان نارد بۆ میسر لە نەخۆشیەکەی دا و پێیان وتین هەرچی لەتواناتاندایە ئەبێ بیکەن ، چونکە مانی عبدالناصر بۆ رووسیا زۆر گرنگە ، کەچی نەمان توانی نەخۆشیەکەی دیاری بکەین و مرد لەساڵی ١٩٧٠دا .

(دکتۆر عەلی جرێشە کەبرایەکی دێرینە لەزمانی ئەفسەرێکی موخابەراتەوە دەڵێت : بەفەرمانی عبدالناصر ژەهریان کردبووە شەربەتی مەلیک عەبدولڵای ئەردەنەوە کەلەمیسربوو ، عبدالناصر بەهەڵە خواردبوویەوەو بووە هۆی تیاچوونی).

هواری بۆمیدیەنیش کە ژنەکەی فەڕەنسی بوو هێنایان بۆ رووسیاو هەرچیمان کرد نەمانتوانی هیچی بۆ بکەین بردیانەوە جەزائیرو پاش ماوەیەکی کەم هەرچەند ئێمەش لەگەڵی چووبووین ناوبراو کۆچی دوایی کرد .

ئەوەی من سەرنجم داوە خۆشەویست (د.خ)هەرگیز لەمەسەلەی ئەجەلدا هیچی نەفەرمووە ، کاتێك کە ئیبراهیمی کوڕی لەماریەی قیبتی لەدایك بوو لەدوا ساڵەکانی تەمەنی موبارەکیدا زۆر دڵی پێی خۆش بوو ،ئەیگێڕا بەسەر صەحابەکانداو پیشانی ئەدان ، کە خوا بردیەوە هیچ دوعای نەکرد کەخوانەیباتەوە.لەکاتێکدا دوعای قبوڵ بوو.

یان کە کچـەکەی دەنێرێـت بەدوایـداو ئـەمیش دەچـێت و کچـەزاکەی لەکۆشیا گیان ئەدات و ئەمیش هۆن هـۆن فرمێسـك بەچـاویادێت وهـیچ دوعا ناکات کە ئەجەلی دوا بکەوێت و تەسلیمی ئەمری خوا دەبێت .

## ئەجەل کەنەهات !

### ١-دکتۆر فازڵ سولەیمان :

بەڕێوەبەری دەزگای پردە بۆ ناساندنی ئیسلام و مەشقی بانگخوازان ، لەساڵی ١٩٨٨ کۆلێژی ئەندازیاری بەشی ئەلکترۆنیاتی تەواوکردووە و ماستەریشی هەیە لە شەریعەتی ئیسلامدا باسی ژیانی خۆی دەکات و دەڵێت :

ئاواتم ئەوە بوو ببمە پزیشك،بەڵام باوکم هەرچەند پزیشك بووحەزی نەدەکرد ئەو ڕێیە بگرم و دەیووت: تۆ باش ناخوێنی و پزیشکیش پێویستی بەخوێندنی زۆرە.

ئاوات و ئامانجی زۆرم هەیە هاتوونەتە دی ، بەڵام ئەم ئاواتەیانم نەهاتە دی هەرچەند دوعاشم زۆرکرد،خوای گەورە ئاواتەکەمی بۆ ڕاست کردمەوە و هەرخۆی دەزانێت چی باشە بۆمان.

زۆر بەختەوەرم کە لەڕێی دەزگای پردەوە خزمەت بە ئیسلام دەکەم و زنجیرەیە فلیمی کورتمان بەرهەم هێناوە بەناوی (تەمومژەکان دەڕەوێنەوە) کەسوودی زۆری لێبینراوە.

که لەزانکۆ دەرچووم بوومە ئەندامی برایانی موسڵمان و فێری مانای خۆشەویستی وبرایەتیان کردم لەبەر خوا، هەرچەند کەچووم بۆ ئەمریکا دابڕام لێیان و کە گەڕاشمەوە بەهۆی ستەم و زوڵم و زۆریناموبارەکەوە نەمتوانی کاربکەمەوە لەگەڵیان.
بە تێپەڕبوونی کات زیاتر هەست بەفەزڵ و هاوکاری خوادەکەم ، هەندێ شتم تووش بوو لەمیسر بۆیە بڕیارم دا بچم بۆ ئەمریکا ،لە دەزگا خێرخوازیە ئیسلامیەکاندا کارم کرد وهەموو ساڵێك بەنوێنەرایەتی ئەو دەزگایانە رۆژی دەو یانزەو دوانزەی سێبتەمبەر ئەچووم بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان،سبحان الله رۆژی ١١ی سێبتەمبەر ٢٠٠١لەگەڵ دووبرادەری تردا ئەمان ویست بچین بۆ (وال ستریت سێنتەر) نیوسەعات وەستاین تەکسیەك نەوەستا بۆمان،زۆر بێزاربووین، تومەز رەحمی خوابوو ، ئەگینا ئێمەش وەك ئەو خەڵکەی تر لە تەقینەوەکاندا تیادەچووین .

٢- **کاك ئەحمەد** لەکەرکوك ئەمەی بۆ نووسیم کە پەندی لێوەرگرین و وتی :لە کۆتایی نەوەدەکاندا هەستم کرد سەرم ژان ئەکا، چوومە لای برایەکی خۆمان سەرو مل پشتم بشێلێ ،دواتر وتی : ئەمە کاری یوگاییە بۆ سەر ئێشە زۆر باشە، کاتێ بە کارەکەی هەستا یەکسەر لە هۆش خۆم چووم و بورامەوە ! ئیتر کەهاتمەوە هۆش خۆم زۆر بێتاقەت بووم.

بۆ بەیانی چووم بۆلای دکتۆر ئینعام لەکەرکوك پسپۆڕی هەناوە ،زۆر ورد بووەوەو پرسیاری زۆری کرد، یەکێك لەوانەی پێمووت کە رۆژانە چەند

جار بەبێ خواستی خۆم زمانم ئەگەزم،وتی : گومانم لە شتێك هەیە لە مێشکت هەبێت بۆ دڵنییایی زیاتر بڕۆ بۆ لای دکتۆر ئەردام پسپۆری مێشکە با ئەویش سەیرت بکا ئەمە نیشانەی صەرعە و ،لەوانەشە گرێ لە مێشکت هەبێت. چوومە لای دکتۆر ئەردام و هەمان قسەی ئەوی کرد و وتی: صەرعە. دوای پرۆسەی رزگارکردنی عیراق وەزع باشبوو گیرفانمان گەرمتربوو چەندین جاری تر چووم بۆ دکتۆر وتیان صەرعە.

رۆژگار هات و ڕۆی تووشی نەخۆشی فرمێسك گیرانی چاو بووم،دواجار وتیان دەبێ نەشتەگەری بۆ بکرێ چووم بۆ نەخۆشخانە تورکیەکە بۆ ئەوەی نەشتەگەریم بۆ بکەن ئەو پارەیەی داوایان کرد زۆر بوو ،وتیان: بۆ چاو باشترە و هەرزانترە بچیتە ئێران نرخی پارەی دابەزیووە و وەك جارانی ئێمەی لێهاتووە، بەو پارەیە نەشتەرگەری ئەکەیت و گەشتیاری خۆشت ئەکەی.

لەساڵی ٢٠١٢ دوو رۆژ پێش موحەڕەم لە حاجی ئومەرانەوە چوینە ورمی و لە دەرمان خانەیەکی شەقامی پزیشکان وتم :خەڵکی کوردستانی باشورم بە تورکمانی قسەمان کرد ،دکتۆری باشم پێبڵێن پسپۆڕی بواری چاو بێت، ئەوان پێی ئەڵێن فوق تخصص چومە لای دکتۆرەکەی بۆیان هەڵدا‌ین رێکەوتێن نەشتەرگەریم بۆ بکا ،بۆ بەیانی دواتر هاوڕێکەم وتی: با بۆ دکتۆری تر بڕۆین بزانین ئەو چی ئەڵێ ،چوین بۆ لای دکتۆری تر ئەویش وتی: نەشتەگەری ئەوێ.

ناردمی بۆ دکتۆری قورِگ وگویٚ، چوین بۆ لای وئەویش دوو فەحسی بۆمان نووسی کەچی دەستمان نەکەوت، چوینەوە بۆلای وتمان: ئەڵێن نیە چی بکەین ؟ نووسراویکی بۆمان کرد بچین بۆ نەخۆشخانەی ئیمام خومەینی،بۆ بەیانی رۆیشتین وتیان: ئەو ئامیرە کار ناکات ،گەڕاینەوە لای هەردووکیان ئەوەی کردمان بۆیانمان گێڕایەوە،دووەمیان رازی نەبوو راپۆرتم بداتیٚ بۆ یەکەم ، دکتۆری چاوەکە وتی: تاڕاپورتم نەداتیٚ من نەشتەگەریت بۆ ناکەم زۆر هەوڵماندا سوودی نەبوو، رەنجمان بە زایە چوو، چوینە سنە لەویٚش هیچمان دەست نەکەوت عاشورا بوو،پاشان چووینە کرمانشاه لەویٚش دکتۆریٚکمان دۆزیەوە و وتی: بەیانی وەرن بۆ نەخۆشخانەی سجاد سەعات ١١ لەویٚ بن نەشتەگەریکەت بۆ ئەکەم ،بەیانی رۆیشتین چوینە نەخۆشخانەکە وتیان: ئەم دکتۆرە نایەتە ئێرە ،وتمان :دوێنیٚ لای بوین مەوعیدمان هەیە وتیان: کەیفی خۆتانە چاوەریٚ بکەن،زۆر دڵگران بووین ئەوێمان بە جێهێشت و گەڕاینەوە.

لە دوای ماوەیەکی تر نەخۆشیەکی ترم تووشبوو پێویستی بە نەشتەگەری هەبوو چووم بۆ دکتۆرو کاتی بۆ دانام لە نەخۆشخانەی ئازادی کەرکوك. بەیانی رۆیشتم دکتۆرەکەم چاوەڕێی ئەکردم ،خۆم گۆڕی وچوومە ژوورەوە دکتۆر هات بانگی کردم وتی: حازری ؟

وتم :بەڵیٚ کەچی بەرپرسی هۆڵی نەشتەگەرییەکە نەیهێشت نەشتگەرییەکەم بۆ بکریٚ وتی: هەندیٚ پشکنینی نوقسانە. ئەی چی بکەین

؟وتی تا ئەو فەحسانە نەکەی نابێت. کردمە هەراو خۆم گۆڕی و هاتمە دەرەوە نەشتەگەریەکەم نەکرد.

ئەمانە هەمووی قەدەری خوا بوون ژیانم دیارە ماوەی مابوو ئەگینا یا لە ورمیٚ یا سنە یا کرمنشاە یا لە شارەکەی خۆم لە کەرکوك ئەگەر بەنج بکرامایە ئەمردم ،دواتر تێگەیشتم کە برادەرێکی دکتۆر پێی وتم خوا رەحمی پێکردووی لە ژێر بەنج دەرنەئەچووی چونکە صرع بەنجی تایبەتی هەیەو دەبیٚ پێش چونت بۆ هۆڵی نەشتەرگەری دکتۆر بزانێت صەرعت هەیە.

**قۆناغەکانی تەمەن :**

قورئانی پیرۆز سەرنجمان بۆ قۆناغەکانی تەمەن رادەکێشێت و دەفەرموێت :

اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنْ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْقَدِيرُ (٥٤) وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ كَذَلِكَ كَانُوا يُؤْفَكُونَ (٥٥) وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَالْإِيمَانَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِلَى يَوْمِ الْبَعْثِ فَهَذَا يَوْمُ الْبَعْثِ وَلَكِنَّكُمْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ (٥٦) فَيَوْمَئِذٍ لَا يَنْفَعُ الَّذِينَ ظَلَمُوا مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ (٥٧)الروم

خودا کە ئێوەی دروست کردووە ، لەسەرەتادا بێهێز بوون ، پاش بێهێزی ، گورِی پێدان ، لەپاشانا هێزو گورِی لێسەندنو پیری کردن ، بەمەیلی خۆی دەئافرێنیٚ ، زاناو توانا هەرخۆیەتی .

رۆژی سەلاٚ کە رِا دەبیٚ تاوانباران سوێندیٚ دەخۆن جیا لەساتێك نەمانەوە ، ئاوا هەرشوێن درۆکەوتوون .ئەو کەسانەی بەزانست و باوەرِدارن ، پێیان ئێژن :

هەروەکو خودا نووسیوویە ، تارۆژی سەلاّ ماونەوە ، سا ئەمە رۆژی سەلاّیە ، بەلاّم ئێوە نەتانزانیوە .

لەو رۆژەدا ئەو کەسانەی کە ستەمیان کردووە ، بەهانەیان قازانجیان پێناگەیەنێ و رێشیان نادرێ داوای لێخۆشبوونی بکەن .

زۆر لە شاعیرانیش باس لەمە دەکەن :

نیشانەی پیری دیاریی دا لەڕووم
سەراپا وێنەی بەفرسپی بووم
ئەستوونی باڵام لەنگە و چەمیوە
کاسەی تەمەنم هاتۆتە نیوە
سەرنج چەند ئەدەم نابینم تۆزقاڵ
ڕێ هەڵە ئەکەم هەروەکو منالّ
سەیرە بەپیری تازە پێئەگرم
دارەدارەم دێ و دەسی ڕێ ئەگرم
پەشمە ئامانجم زیندەچاڵ کراو
ڕەنجم پێوانەی پایەماڵ کراو
خەرمانی ژیری شەن و کەو ئەکەم
بەئاگا نایەم تاسەی خەو ئەکەم
داخم ئەو خەوە ئەنجامی تەمەن
هەندێ بێهودە کێشانەی ئەکەن
نازانن ڕەوتی قۆناغی پیری
پڕە لەوانە و ئەزموونی ژیری ...هۆنراوەی محمد عەزیز

**بەو هیوایەی سوودتان وەرگرتبێت و کاربکەن بۆ دونیاو قیامەتتان تا بەیەکگەیشتنەوەیەکی تر بەخواتان دەسپێرم .**

**پێڕست**

پەڕاوەکانی نووسەر:

١- بەرەو پەروەردەی ئیسلامی

٢- بەرچاو روونی

٣-فەرهەنگی بانگخوازان

٤-لەخزمەت قورئاندا

٥-بەهاری دلآن

٦-ژیانەوە

٧-رازی قورئانی

٨-بەرەوئیسلام

٩-رامان لە قورئان

١٠- نوێبوونەوە

١١- سینە

١٢-قورئان پارێزراوە

١٣- دەستی گەل

١٤- پەیامێکی ئاسمانی

١٥- ئەزموون

١٦- بەرەو بەهەشت

١٧- بەڵێنەکانی قورئان

١٨-زەوقوسەلیقەیبڕوادار

١٩- رووسپیەکان

٢٠ - بالآنس

٢١- زەردەخەنی هیوا

٢٢- دۆستانی خوا

٢٣- فیداکاران

٢٤-دیمەنەکانی قورئان

٢٥-فراوانی مانا لە قورئانا